# کاروان

گۆڤارێکی ڕۆشنبیریی مانگانەیە

ئەمینداریتی ی گشتی ی ڕۆشنبیری و لاوان بە زمانی کوردی و عەرەبی دەری دەکا

سەرنووسەر
محمد أمین محمد احمد

جێگری سەرنووسەر
حسین عارف

52

کانوونی دووەم/١٩٨٧

ساڵی پێنجەم

لەم ژمارەیەدا



ئەدرەس :
هەولێر : ئەمینداریتی ی گشتی ی ڕۆشنبیری و لاوان
گۆڤاری «کاروان» ت : ٢١٩٢٢

نرخی (٢٥٠) فلسە

لە کتێبخانەی نیشتمانی لە بەغدا ژمارە «٤٨٣»ی ساڵی «١٩٨٢»ی دراوەتێ

لە چاپخانەی (الادیب البغدادیة) چاپکراوە



# کۆڕێکی فراوان بۆ چلەی ماتەمینی شاعیری نەمر کامەران موکری «محمد احمد طه ١٩٢٩ - ١٩٨٦»

کەوتوومە ڕێگا لەگەڵ کاروانا
پاداشتم ناوێ لە تێکۆشانا
تا دڵ لێبداو خوێنم تیا مابێ
بۆ کورد ژیانم هەر ئەبێ وابێ
بە سووتاندنم ڕێگە ڕۆشن بێ
با ئاگر بەشی ئەم لەشەی من بێ
● کامەران ●

دەزگای ڕۆشنبیری‌و بلاوکردنەوەی کوردی ، سەر لە بەیانی‌ی ڕۆژی هەینی ١٦/١/١٩٨٧ ، لە هۆڵی ڕۆشنبیری‌ی جەماوەر لە سلێمانی ، کۆڕێکی فراوانی بۆ چلەی ماتەمینی شاعیری نەمرمان کامەران مووکری سازکرد. کۆڕەکە لە سەعات «٩ر٤٥»ی بەیانیدا دەستی پێ کردو لە سەعات «٢ر١٥»ی دوای نیوەڕۆدا کۆتایی هات کە کۆمەڵێك وتارو شیعری لە لایەن شاعیرو ئەدیبانی کوردەوە تیادا پێشکەش کرا.

کۆڕەکە سەرەتا بە چەند ئایەتێکی قورئانی پیرۆز دەستی پێ کردو ئینجا ئامادەبووان ، دەقیقەیەك بە ماتەمی بۆ گیانی پاکی شاعیری نەمرمان ڕاوەستان.

دوای ئەوە مامۆستا مستەفا سالح کەریم ، پوختەیەکی ژیانی ئەدەبی‌و ڕۆشنبیری‌و هونەری‌و ڕامیاری‌ی «کامەران مووکری»ی خستە ڕوو ، هەر لە سەرەتای چوونە نێو دونیای ئەدەبی‌یەوە کە تەمەنی «١٦» ساڵان بووە ، تاوەکو ئێوارەی ٧/١٢/١٩٨٦ کە لە سەعات «٨ر٤٥»دا بۆ دواجار ماڵئاوایی لێ کردووین‌و ، لەشارە دێرینەکەی هەولێر تەرمەکەی گوێزراوەتەوە بۆ شاری سلێمانی‌و ، بۆ ڕۆژی دوایی لەگردی سەیوان بەخاك سپێرراوە . .

– پاشان مامۆستا «مستەفا نەریمان» ووتاری دەزگای ڕۆشنبیری‌و بلاوکردنەوەی کوردی خوێندەوەکە بەخێرهاتنی ئامادەبووانی کردو پەنجەی بۆ دەورو چالاکی‌یە ئەدەبی‌و ڕۆشنبیری‌یەکانی شاعیری نەمر «کامەران موکری» درێژ کردو ، لەو ڕێبازەی دوا کە لە بواری ئەدەبدا گرتبووی.

– ئینجا مامۆستای دوکتۆر «عزالدین مصطفی رسول» ، ووتارێکی تایبەتی خوێندەوەو گوتی :

«ئەخۆڵ شاعیری لاوان بوو ، دەربڕی سۆزی دڵی برژاوی دلداران بوو ، تۆمارکەری ڕابردووی سەیوان بوو ، شێردڵ ، نووری ڕۆڵەی نیشتمان بوو ، عاشقی کوردستان بوو ، باسی خاڵێکی شاعیری جوانەمەرگ مەلا سەعدی لەناو ماڵداو ، لە

هەڵسی و کەوتی ڕۆژانەی دایکی جگەر سوزدا و یێدی سەرزمان بوو ، هەموو ئەمە لەکاتی هۆش کردنەوەو گوێ ڕاگرتن و زمان پژانەوە ، گوێش کەری کامەران بوون» .

هەروەها بەووردی لەبارەی ژیان و تێکۆشانی کامەرانی شاعیرو نیشتمان پەروەر دواو ، باسی ئەو وەفاداریی و دڵسۆزی یەی کامەرانی کرد کە بوویەتی سەبارەت بە وولآت و بە کوردستان و مرۆڤایەتیی و ، دەنگێکی دلێربووەو سنووری وولآتی بڕیوەو گەیوەتە هەندەران و ، هاوبەشی زام و ئازارەکانی ی قەوماوانی گەلانی جیهان بووە . .

– دوای ئەو مامۆستا «عبداللطیف گلی» ووتاری «کۆڕی زانیاری عیراق – دەستەی کوردی خوێندەوە ، کە تیایدا ، پرسەنامەی کۆڕی زانیاری عیراق و ، «دەستەی کورد»ی لەکۆڕدا پێشکەش بە بنەماڵەی شاعیری کۆچ کردوو «کامەران موکری» کردو ، پەنجەی بۆ ئەو دەورە دیارەی شاعیر ڕاکێشا ، کە بوویەتی لەبواری خزمەت کردنی ئەدەب و ڕۆشنبیریی کوردی و ، پەروەردەکردن وەکو مامۆستایەك لەزانکۆداو ، پێگەیاندنی بەشێکی زۆری قوتابیانی بەشی کوردی و ، ئەوەی ڕاگەیاند ، کە کۆچ کردنی ئەو شاعیرو مامۆستایە خەسارەتێکی گەورەبوو ، بەلآم هەرگیز مرۆڤی ئاوا لەبیر ناچێتەوەو ، هەمیشە لەدڵ و دەروونی هەمواندا دەژی» .

– پاشان کاکەی فەللاح شیعرێکی خوێندەوە دوا بەدوای ئەویش مامۆستای دوکتۆر «احسان فؤاد» ووتارێکی خوێندەوە کە تیایدا باسی ژیان و تێکۆشانی ئەو شاعیرە نەمرەی کردو ، پەنجەی بۆ ئەو هەوڵ و کۆششە بێ پایانەی «موکری» ڕاکێشا کە لە بواری ئەدەب و ڕۆشنبیریی و ڕۆژنامەنووسیدا بوویەتی و ، چارەنووسی شاعیری بەچارەنووسی نەتەوەکەیەوە گرێ دا ، ئینجا هەندێ نموونەی لە شیعرەکانی خوێندەوەو ، باسی ئەو ووردەکاری یانەی کرد کە لەبواری شیعردا بوویەتی و ، گوتی : «بێ دەنگی کامەران هەرگیز مانای ووشك بوونەوەی نەبەخشیوە ، بەڵکو هەندێ جار بێ دەنگی لەهەموو دەنگێ بەهێزتر بووە ، کامەران هۆنراوەی بۆ هاتووە ، بەلآم بەزۆر شیعری نەگوتووە» .

ئەوەی شایانی گوتنە ووتارە پڕ سۆزەکەی خوشکە «ئەستێرە»ی کچی شاعیری نەمر ، هەستی هەموو بەشدارانی چلەی ماتەمینەکەی بزواند ، تەنانەت بەشێکی زۆری ئامادەبوان لەگەڵ خوێندنەوەی ووتارەکەدا فرمێسك بەری چاویانی تەنی و ئەو ساتە لەگەڵ گیانە نەمرەکەی موکری دا دەژیان و ، لەگەڵ هەر دێڕێکی ووتارەکەدا وێنەیەکی مەزنی پڕ شکۆی کامەران دەخزایە نێو دڵ و دەروونی هەموو لایەکەوە .

– هەروەها چەند ووتارێکی تریش خوێندرانەوە ، کە هەر هەموویان دڵسۆزی و وەفاداری نووسەرەکانیان دەردەبڕی بەرامبەر بە کامەرانی شاعیرو مرۆڤ ، کامەرانی دڵسۆزی نەتەوەو مرۆڤایەتیی و ووشەی ڕەسەنی کوردی ، کامەرانی ئەدیب و شاعیرو ڕۆژنامەنووس و مامۆستا ، لەو بیرەوەری یانە دەدوان کە بوویانە لەگەڵیدا ، لەڕۆژگارە جیاجیاکانی خۆشی و ناخۆشی سالآنی زووی ژیانی دا . .

ئەوانیش ئەم بەڕێزانە بوون :

**شهاب عثمان ، عبدالله عزیز خالد ، کریم زەند ، د . شکریە رسول ، محمد معروف فتاح ، طاهر صالح سعید ، ممتاز حەیدەری ، حمە سعید حمە کریم ، یاسین قادر بەرزنجی ، لطیف هەڵمەت .**

هەروەها ئەم شاعیرە بەڕێزانەش ، هەر یەکەیان بە پارچە شیعرێك ، هەست و سۆزی وەفاداریی و خۆشەویستیی خۆی بەرامبەر بە کامەرانی هاوڕێ و برادەرو مامۆستای دەربڕی :

**کاکەی فەللاح ، حسیب قەرەداغی ، شێخ حسن بەرزنجی ، جمال شارباژێری ، ع . ح . ب ، شفیقە علی «لەیلان» ، اسماعیل عارف ، محمد صدیق محمود ، ئەزی گۆران ، محمد امین پێنجوینی ، خورشیدە بابان ، اسماعیل خورمالی ، عمر عبدالرحیم ، مەلا توفیق ، بەرزان هەستیار ، جمال محمد اسماعیل ، نەوزاد علی احمد ، هۆگر محمود ، هیدایەت حەیران .**

* هەروەها بەڕێز مامۆستا «طه بابان» شیعرێکی خوالێ خۆشبووی خوێندەوە ، وێڕای پێشەکی یەکی تایبەتی کە خۆی ئامادەی کردبوو .

کاك «جمال غەمبار»یش شیعری «جمیلە»ی خوێندەوە ، کە کامەرانی نەمر لە ساڵانی بەرپابوونی شۆڕشی جەزایەر ، پێشکەشی کردبوو بە کچە شۆڕشگێڕو ئازادیخوازی جەزایەر «جمیلە بوحێرد» .

● برووسکەو نامە ●

ئەم برووسکەو نامانەیش خوێندرانەوە کە ئاراستەی لیژنەی چلەی ماتەمو بنەماڵەی شاعیری کۆچ‌کردوو «کامەران موکری» کرابوون .

● برووسکەی بەشی کوردی – کۆلیجی پەروەردەی زانکۆی بەغدا – کە د. ووریا عمر أمین ناردبووی . .

● برووسکەی مامۆستاو قوتابیانی کۆلیجی ئەدەبیاتی زانکۆی سەلاحەدین – لە هەولێر . .

● برووسکەی پەیمانگەی هونەرە جوانەکان – لە سلێمانی . .

● برووسکەی کۆمەڵەی هونەرە جوانەکانی کورد – مەڵبەندی گشتیو هەموو لقەکانی .

● برووسکەی مامۆستا «فؤاد حمە خورشید» کە لە بەغداوە ناردبووی . .

– لە کۆتایی چلەی ماتەمینەکەدا کە چوار سەعاتی تەواوی خایاند ، مامۆستا «مستەفا نەریمان» نوێنەری دەزگای ڕۆشنبیریو بلاوکردنەوەی کوردی ، بەناوی دەزگاکەوە ، دوو دیاریی – کە بریتی بوون لە دوو وێنەی شاعیری نەمر کامەران موکری – پێشکەش بە بنەماڵەی خوالێخۆشبوو کرد . .

– دوای ئەوە مامۆستا «ئەخۆڵ»ی شاعیر بەناوی بنەماڵەی خوالێخۆشبووەوە ، ووتارێکی خوێندەوە . تیایدا سوپاسی دەزگای ڕۆشنبیریو بەشدارانی چلەی ماتەمینی کامەران موکری برای کردوو ، هەر بەو بۆنەیەشەوە پارچە شیعرێکیشی خوێندەوە . . ئینجا کۆتایی بە کۆڕەکە هێنرا . .

– دوا بەدوای تەواوبوونی کۆڕی ماتەم ، بەشداربوانی چلەو ئەو میوانانەی کە لە دەرەوەی سلێمانییەوە هاتبوون . سەردانی ئەو پێشانگایەیان کرد کە بۆ وێنەکانی خوالێخۆشبوو «کامەران موکری» لە هۆڵێکی تری بەڕێوەبەرایەتی ڕۆشنبیریی جەماوەر ساز کرابوو .

# لە چلەی کامەران موکری

● مومتاز حەیدەری ●

کامەرانی نەمر دەڵێ :–

**هەنسکی دایکی نیشتمانەکەت**
**پشکۆی هەڵمەتی گیانی خۆش کردی**
**هاورێم بۆ کوردو کوردستانەکەت**
**کۆچت‌کرد ، بۆیە من نالێم مردی**

ئەمە کامەرانی شاعیر لە بارەی کۆچ‌کردنی نیشتمانپەروەرێکی کورد بڵێ . . . ! ئەی ئێمە بۆ مرۆڤەکی چاکەخوازو دڵسۆزو تێکۆشەرێکی ڕێگای سەرفرازی نەتەوەو شاعیرێکی هاوچەرخو ڕەخنەگرێکی وردبین ، بە کۆمەڵێ ئازارو ئاواتەوە ، لە ڕۆژگارێکی ئاڵۆزو ناسکدا ، بەبێ دەنگی کۆچ بکا دەبێ چی بڵێین . . . ؟ ! چی بکەین . . ؟

لە ئاستو دەرهەق ، ئەم کەڵە مروڤو شاعیرەدا ، بەم دەمو دەستو دەست‌کورتی‌یە ، تەنیا ئەوەی بگوترێو بکرێ . . دووبارە ، سێبارە ، بە کارو کردەوەو هەڵوێستو شیعرە جوانو پاكو نیشتمانپەروەری‌یەکانی‌دا بچینەوەو وەك مەشخەڵو چەپکە گوڵی وەفاداری بە نەوەی نوێی پێش‌کەش بکەین . . !

لە یادی دوو سەد ساڵەی سلێمانی‌دا گوتمان : « . . ئەو شارەی دوو سەد ساڵە دۆڵی ژانو خەمو ئەشکەنجەی ڕۆژگارە ، بەڵکو ئەم شارە یەکەم خشتی بە فرمێسكو خوێن شێلراوە ، لە کورەی مل‌ملانێی چینایەتیو نەتەوەیی‌دا برژاوە ، بە ئاوی جوانیو گوڵی سروشتو شیعرو گیانی هونەریی مووترەبە کراوە ، بە هەی‌ڕۆ ، هەی‌ڕۆ فرچکی گرتووە . . .» !

شاعیری گەورەمان نەك تەنیا نیشانەو نموونەیەکی زیندووی ڕەسەنی کاکڵو گەوهەری مێژووی شکۆمەندی‌ی ئەم دوو سەد ساڵەی ڕەوتی خەباتی درێژخایەنو ژیانی ڕۆشنبیریو ئەدەبیو هونەریو جوامێری‌یە ، بگرە سوارچاکێکی لێهاتووی سەربڵندی ڕێرەوی ئازادی خوازی نەتەوەیی کوردو شاری





ھەڵمەت و قوربانی بوو .

ئەم کەڵێنە گەورەی مامۆستا کامەران لەم رەوتە پیرۆزەدا بە ئاسانی دروست نەبوە ، بەڵکو لە ئەنجامی نیشتمانپەروەریی بنەماڵەکەی و ئێش و ئازارو شەونخونی و دەربەدەریی دەیان ساڵ و لێھاتوویی و بروا بە میللەت بوون و ئازادی نیشتمان و سەربەستیی مرۆڤ دروست بووە ، بگرە ھێشتا مێرد منداڵەو نەمامێکی ناسك بووە ، کەھەست و گیانی کوردپەروەریی جۆشی سەندوەو بەھرەی شیعریی لەلای سەری ھەڵداوەو ئێش و ئازاری کۆمەڵایەتی و نەتەوەیی لە ھەسانی داوەو بۆوەتە ھەوێنی شیعرەکانی ، ئەوەتا لە ناخەوە ھاوار دەکاو دەڵێ :-

**چاوم ھەڵھێنا ، دیم ئەم میللەتە**
**دیمەنی ژینی قەنارەو پەتە**
**گوێم بە دەنگی (ئاخ) زرنگایەوە**
**دەمم بە ھاوار ھەڵھێنایەوە**
**بۆیە . ھەر ئەبێ پشکۆی تولە بم**
**قوربانی خاك و ھی ئەم خولە بم ! !**

مامۆستا کامەران - محەمەدی ئەحمەدی تاھا - لە بۆتەی ژیانی دژواری کۆمەڵایەتی و نەتەوەیی و بە گیانێکی رەسەنی کوردانەو ریبازی تێکۆشەرانە پەروەردە ببوو ، بۆیە لە ناخەوە ، خەم خۆری زەحمەتکێشان و دژی جەورو ستەمی زۆرداری بوو ، ھەروەھا تێکۆشەرێکی راستگۆی رێگای سەربەستی و یەکسانیکردنی ئافرەتی لە گەڵ برای‌دا بوو . . بگرە لە ئەنجامی باری ناھەمواری تایبەتی و گشتیی بنەماڵەو نیشتمانەکەی و ھەروەھا لەتەك ژیریی و ھەست ناسکی و تواناو پشوودرێژی خۆیدا ، مامۆستا کامەران نمونەیەکی کەم وێنەی مرۆڤەکی دڵسۆزو ھێمن و بێفیزو تێکۆشەرێکی گەورەی رەسەنی کورد بێ . . . ئەوەی بە وردی بە مێژووی ژیانی مامۆستا کامەران و شیعرو نووسینەکانی‌دا بچێتەوە ، زۆر بە توندی ، راستیی قسەو بۆچوونەکانمان دەسەلمێنن .

مرۆ کە شیعرەکانی کامەران دەخوێنێتەوە ، یان گویان لێ‌دەبێ ، لە ناخەوە رادەچلەکی و ھەست و گیانی گڕ دەگرن و بڕوای زیاتر بە سەرکەوتنی نەتەوەو نیشتمانەکەی قایمتر دەبێ ، پیاوی ترسنوکیش رووزەردی و شەرمەزاری دای دەگرێ . ئەوەی شایانی باسە ، لە کۆتایی پەنجاکان و لە سەردەمی شەوەزەنگی گەل و نیشتماندا ، واتا بەر لە شۆرشی ١٤ی تەمووز ، شیعرەکانی مامۆستا کامەران ، سەدان لاوی کوردی دەھێنانە جۆش و خرۆش و ھەژان ، سەرنج بدەن چۆن لەو بارەوە گوتوویەتی :-

**ئەوی مێژووی کورد بخوێنێتەوە**
**ئەلقەی زنجیرەی بھۆنێتەوە**
**تێ‌ئەگا ، ھەرگیز سەر نانێتەوە**
**ھیچ ھێزێك نیە ، بیتوێنێتەوە**
**ئەو چەرخە نەما ، درەختی رەگەز**
**ریشەی دەرکێشن ، ھی ئێمەی نەبەز**

بە کورتی : مامۆستا کامەران موکری مرۆیەکی ، زێدە ھێمن و دڵپاك و قسەخۆش و راستگۆو ئاسایی بوو . ئەوەندەی‌تر مرۆیەکی گەورەو شاعیرێکی ھەڵکەوتوو رەخنەگرێکی کارامە بوو . . چۆن بەبێ دەنگی دەژیا ئەوەندەش گەورە بوو ، ئاواش بەبێ دەنگی و گەورەیی لەگەڵ بارێکی قورسی خەم و خەفەت و ئێش و ئازاری تایبەتی و گشتی گردی سەیوانی خانەوادە بێچاوەنواری بەو پەری ئاخ و داخ و پەرۆش و بە شانازی‌یەوە باوەشی نەمریی بۆ کردەوە .

لە کۆتایی‌دا زۆر بە کورتی و دووبارە دەیڵێمەوە کۆچ‌کردنی مامۆستا کامەران زیانێکی گەورەو سەخت بوو لە نەتەوەی کوردو ئەدەبەکەی کەوت ، کە بە ھیچ جۆرێك کەلینەکەی پڕ نابێتەوە ، ھەروەکو شاعیرێکی کۆچ کردووی چلەکان دەڵێ :-

برام ھەر خاسی کوردانە لە ناوەختا لە دەسمان چوو
گران دەردێکە ئەم ژانە ، مەڵێن تیماری ئاسانە

● لەگەڵ چەپکێ گوڵ و وشەی پاك و رەنگین‌دا بۆ گیانی پیرۆزی شاعیری گەورەی کورد .

دەخنەو لێکۆڵینەوە

# بنەڕەتی کێشێکی عەرووزی و کێشی دوو هۆنراوە

ئەحمەد هەردی

## (١)
## بنەڕەتی کێشێکی عەرووزی

مامۆستا «عبدالرزاق بیمار» لە گۆڤاری «ڕۆشنبیری نوێ»دا وتارێکی نووسیبوو دەربارەی : «سێ کێشی عەرووزی لە هەڵبەستی کوردیدا»[١] کە لە کێشی «موضاریع»و «موتەقارەب»[٢] و «خەفیف» دوابوو . جا لەبەر ئەوەی منیش ماوەیەکە خۆم بە ساغ‌کردنەوەی کێشە عەرووزی‌یەکانی شیعری کوردی‌یەوە ، خەریك کردووە ، بە پێویستی ئەزانم لەم سوچەوە سەیرێکی وتارەکەی بکەم . ئومێدم وایە ، بە سنگێکی فراوانەوە ، بیخوێنێتەوە .

لە سەرەتاوە مامۆستا نووسیبووی کە پەیڕەوی دوو خاڵی کردووە ، یەکێکیان ئەوەیە کە لە خاڵی «٢» دا ئەڵێ : (لە زانستی عەرووزدا زاراوە گەلێکی زۆر هەیە بە پێویستی نازانم وەریان بگێڕینە سەر کوردی وەکو بەحر ، وەتەد ، سەبەب ، مقصور ، مخبون[٣] .. هتد) . ئەڵێم منیش ئەم قسەیەم لاپەسەندەو وای بەڕاست ئەزانم کە لەم وتارەدا ، پەیڕەوی ئەم پێشنیارە بکەم . دووەمیشی ئەوەیە : کە منیش بۆ برگەی کورت ، ئەم نیشانە : (ب) ، وە بۆ برگەی ناوەڕاست نەك درێژ ئەم نیشانەیە : (–) دابنێم ، کە کاك (بیمار) لە خاڵی (٤)دا بە برگەی[٤] درێژی داناوە . دوای ئەم سەرەتایە ، بابچینە ناو جەرگی باسەکەوە .

مامۆستا (بیمار) کە باسی کێشی (موضاریع) دەکا . لە خاڵی (٣) و (٤)دا ، دوو جۆری لێ دەژمێرێ[٥] . کە من بە کێشی (موضاریع) یان نازانم . بەلاَم لە پێشەوە ئەمەوێ دوو خاڵ ڕوون بکەمەوە .

یەکەمیان ئەوەیە : ئەوەی کاك (بیمار) لە خاڵی (٣) و (٤)دا بە دوو کێشی ئەزانێ . هەردووکیان یەك کێشن . تەنانەت (بیمار) خۆشی دانی بەوەدا ناوە[٦] .

دووەمیش ئەوەیە : ئەمەوێ هەڵەیەك ڕاست بکەمەوە . کە من بە هی چاپی ئەزانم . ئەویش بریتی‌یە لەوەی مامۆستا (بیمار) لە ژێر خاڵی (٤)داو لە دێری (٢)دا . (فاعلاتن) یاخود (فعلاتن) ، بە پێی یەکەم ، واتە بە (تەفعیلە)ی یەکەم دائەنێ[٧] ، کەچی لە پاش چەند دێرێك بە (پێی دووەمی) لە قەڵەم ئەدا[٨] . کە بێ‌گومان ئەمەی دووەمیان ڕاسترەو هی یەکەمیان هەڵەی چاپە چونکە تەفعیلەکان یاخود بڵێم : پێ‌یەکانی ئەم کێشە بەم جۆرەیە :

| مَفاعِلُنْ | فَعِلاتُنْ | مَفاعِلُنْ | فَعِلُنْ |
|---|---|---|---|
| ب – ب – | ب ب – – | ب – ب – | ب ب – |

واتە : (فَعِلاتُنْ) تەفعیلەی دووەمە نەك یەكەم .

دوای ئەم روونكردنەوەیە ، با بپرسین : ئایا راستە ئەم كێشە وەك مامۆستا (بهار) ئەڵێ : (موضاریعی هەشت تەفعیلەیی مەقبوضی مەخبونی مەحذوفە[٩] ! ؟) لە وەڵامدا ئەڵێم : هەرچەندە مامۆستا تەفعیلەكانی بە شێوەیەكی راست نووسیوە ، بەڵام داخەكەم نە ئەم كێشە (موضاریع)ەو نە زیحافەكانی بەم جۆرەیە .

بەڵكو ئەم كێشە (موجتە سی مەخبونە = المجتث المخبون) كە تەفعیلەی چوارەمی ، تووشی (حەذف) بووە . جا با بزانین چۆن ؟ . كێشی (موجتەسی) هەشت تەفعیلەیی لە بنەڕەتدا بەم جۆرەیە :

مُسْتَفْعِ لُنْ فاعِلاتُنْ مُسْتَفْعِ لُنْ فاعِلاتُنْ[١٠]

— — ب —   — ب — —   — — ب —   — ب — —

لە دواییدا دوو قۆناغی بڕیوە ، یاخود بڵێم دوو گۆڕانی بەسەردا هاتووە لە گۆڕانی یەكەمدا هەر چوار تەفعیلەكە تووشی (خەبن) بوون . واتە : (پیتی نەجووڵاوی دووەمی هەر چواریان ، فڕێ دراوە) . لەمەوە (تەفعیلەی) یەكەمو سێیەم ، بوون بە : (مُتَفْعِلُنْ) (ب — ب —) . لە پاشدا (مَفاعِلُنْ) خراوەتە جێیان . هەروەها تەفعیلەی دووەمو چوارەمیش بوون بە : (فَعِلاتُنْ) ، وەكو لە خوارەوە ئەیان بینین :

مَفاعِلُنْ فَعِلاتُنْ مَفاعِلُنْ فَعِلاتُنْ[١١]

ب — ب —   ب ب — —   ب — ب —   ب ب — —

ئەم كێشە لەم قۆناغەدا ، واتە بەم شێوەیە لای عەرووز ناسانی عەرەبو فارس هەیەو هەر بە كێشی (موجتەسی مەخبون) ناسراوە . بۆ راستی قسەكەم ، دوو نمونەی عەرەبیو فارسی ئەهێنمەوە ، كە هەردووكیان لە دوو سەرچاوەی (عەرووزی)یەوە ، وەرگیراون . ئەوەندە هەیە ، لە عەرەبیدا ئەم كێشە چوار (تەفعیلە)ی هەیەو لە فارسیو كوردیدا هەشت


ئەحمەدی خانی

تەفعیلە . بەڵام گرنگ ئەوەیە كە : كێشی هەردووكیان (موجتەسسی مەخبون)ە .

١ - لە كتێبی «الاقناع»[١٢] ەوە :

وَلَوْ عَـلـقْتَ بِسَـلْمىٰ    عَـلِـمْتَ أن ستـموتُ

كە بەم جۆرە كەرت ئەكرێ :

وَلَوْ عَلِقْ   تَبِسَلْمَا   عَلِمْتَأَنْ   سَتَموتُو

ب — ب —   ب ب — —   ب — ب —   ب ب — —

مَفاعِلُنْ   فَعِلاتُنْ   مَفاعِلُنْ   فَعِلاتُنْ

لە كتێبی (بحور الألحان)[١٣] ەوە . (سەعدی) ئەڵێ :

هـزار جـهـد بـكـردم كـه سر عشق بپوشم
نـبـود بـرسر اتشن مـیسرم كـه نجوشم

كەرت كردنی :

هەزارجەهـ   دبكەردەم   كی سرری عیشـ   قبپووشەم

ب — ب —   ب ب — —   ب — ب —   ب ب — —

نەبودبەر   سەری ئاتەش   مویەس سەرەم   كی نەجووشم

ب — ب —   ب ب — —   ب — ب —   ب ب — —

مَفاعِلُنْ   فَعِلاتُنْ   مَفاعِلُنْ   فَعِلاتُنْ

ئەبێ لە خوێندنەوەدا ، لەنگەرێك بخەیتە سەر (ڕێ)ی



(حاجی)

(هەزار) لە دێری یەکەمدا ، یاخود بڵێم : (رێ)یەکە بکەی بە بڕگەیەکی کورت (ب) ، بەم جۆرە :

(هە – زا – ر = مفاع) ، واتە :(هە – زار جەهـ =مفاعلن)

⏑ – ⏑ ⏑ ⏑–⏑ ⏑ – ⏑ – ⏑ –⏑–

هەمان شت لە گەڵ (دال)ی (نەبود) بکەی لە دێری دووەمدا .

ئەگینا لەوانەیە وابزانی کە (تەفعیلەکە) بە (مَفاعیلنْ) ⏑–––

ئەکێشرێ (هەزار جەهدی = مَفاعیلنْ) ، کە ئەمەیش لەم ⏑– – ⏑–––

کێشەدا هەڵەیەکی ئاشکرایە . چونکە ئەصلی تەفعیلەکە (مُسْتَفْعِلنْ)ە ، کە هەرگیز نابێ بە (مَفاعیلنْ)(١٤) .

هەر بەوپێیە ، لەنگەر ئەچێتە سەر (دال)ی (جەهد) و (قاف)ی (عیشق) لە دێری یەکەمدا . وەکو وتم ئەم کێشە لە کوردیدا ، وەکو شیعرەکەی (سەعدی) ، بریتییە لە هەشت تەفعیلە ، یاخود هەشت هەنگاو . ئینجا ئەمەی کە باسم کرد ، گۆڕانی یەکەمبوو . لە دوای ئەوە ، گۆڕانێکی کەی بەسەردا دێ ، یاخود بڵێم : تەفعیلەی چوارەم ، لە دوای (خەبن) ، تووشی (حەذف) ئەبێ . واتە : (دوا بڕگەی تەفعیلەی چوارەم ، فڕێ ئەدرێ) ، (فَعِلا) [ب ب –] ئەمێنێتەوە ، ئەمیش ئەکرێ بە (فَعِلنْ = ب ب – ) . بۆیە کێشەکە بەم جۆرەی لێدێ :

مَفاعِلنْ فَعِلاتُنْ مَفاعِلنْ فَعِلنْ

⏑–⏑– ⏑⏑–– ⏑–⏑– ⏑⏑–

بەڵام جاری واهەیە (تەفعیلە)ی چوارەم ، لەباتی ئەوەی تووشی (خەبن)و (حەذف) بێ ، تووشی گۆڕانێکی کە ئەبێ پێی ئەڵێن : (بەتر)(١٦) کە بریتییە لە (حەذف)و (قەطع) .

(حەذف – فاعِلاتُنْ – فڕێدانی بڕگەی دواییەکە بریتییە لە – تن – هەتا ئەبێ بە – فاعِلا –) . (قەطع – یش ئەوەیە «ئەلِی – عِلا» فڕێ دەیت ، ئینجا «لامە»کەی ئەبزێو «ساکن»کەی ، هەتا ئەبێ بە «فاعِل» « – – » ئینجا «فِعْلُنْ» بخەیتە جێی) .

جاری واش هەیە (تەفعیلە)ی چوارەم ، دوای (خەبن) تووشی (قەصر) ئەبێ تا ئەبێ بە (فَعِلانْ = ب ب – /ه) ، یاخود لە دوای (بەتر) ، تووشی (ئیسباغ) ئەبێ ، هەتا ئەبێ بە (فعْلانْ) (– – / ه) . کە پێویستە ئەک ئەوە زیاتر ئەسەری بڕۆم

ئەمەیە بە کورتی (زیحاف)و بەسەرهاتی (تەفعیلە)کانی ئەم کێشەکە بە ئاشکرا دیارە لقێکە لە کێشکەکەی پێشوو ، وە لەو جیابووەتەوە . واتە : جۆرێکە لە جۆرەکانی (موجتەسسی مەخبون) . هەرچەندە ئەم کێشە بەم شێوەیەی دوایی واتە :

مَفاعِلنْ فَعِلاتُنْ مَفاعِلنْ فِعْلُنْ

⏑–⏑– ⏑⏑–– ⏑–⏑– ––

یان : (فعلن) ، لە سەرچاوە عەرووزییەکانی شیعری

عەرەبدا نی‌یە ، بەلاَم لە شیعری کوردی‌و فارسی‌دا هەیەو عەرووز ناسانی وەکو : (شەمسەددینی رازی)[17] و (وەحیدی تەبریزی)[18] و (د . خانلەری)[19] ، باسی ئەم کێشەیان کردووەو بە لقێکی (موجتەسسی مەخبون)یان لە قەلَەم داوە . وە ئەگەر لە درێژبوونەوە نەترسامایە ، لە هەریەکەیان ، نموونەیەکم پێش‌کەش دەکردن .

دوای ئەم بەلَگانە ، ئەبێ ئەوە بزانین ، کە زۆربەی عەرووز ناسان – تاک‌و تەرایەکی لێ دەرچێ – لەسەر ئەوەن کە (فاعلاتن) لە کێشی (موضاریع)دا ، بەم جۆرە دەنووسرێ : (فاع‌لاتن)[20] . واتە (خەبن)ی تووش نابێ . چونکە (فاع) وەتەدەو زیحاف نایگرێتەوە . هەرچەندە قسەی ئەو تاک‌و تەرایە راست تریش‌بێ‌و (فاعلاتن) بەسە بە بێش دەست پیێبکا ، گرنگ ئەوەیە بلێین : ئەم تەفعیلەیە لە (موضاریع)دا (خەبن)ی تووش نابێ .

وەوای دابنێین کە ئەمە لە یاسا دەرچوونێکە لەم کێشەدا (شذوذ عن القاعدة) . چونکە بەم جۆرە ئەتوانین لە گەلێك سەریەشە رزگارمان‌بێ . ئەگینا یەکێك لەو سنوورانە ئەروخێنین کە ئەم کێشە لە کێشی (موجتەسسی مەخبون) ، جیا ئەکاتەوە ، وەکو لەمەودوا ئەیبینین .

لەمەو پێشتر وتبووم : هەرچەندە مامۆستا (بهار) تەفعیلەکانی بە شێوەیەکی راست نووسیوە ، بەلاَم ناوی کێشەکەو (زیحاف)ەکانی نەپێکاوە . جالێرەدا لەوانەیە یەکێك بپرسی‌و بلێ : کەسێك تەفعیلەکانی کێشێك بزانێ ، چۆن ناوی کێشەکەی نازانێ ؟ ! . . وەیان بلێ : بۆچی هەر کێشێك تەفعیلەی جیاوازی خۆی نی‌یە ؟ . لە وەلاَمی ئەم پرسیارانەدا ، زۆر بە کورتی ئەلێم : کێشەکان گەلێکیان سنووری نێوانیان تەسکەو جاری واهەیە بە هۆی (زیحاف)ەوە ، زۆر لە یەك نزیك ئەبنەوە . وەکو ئەم دوو کێشەی ئێستامان . واتە کێشی (موضاریع)و کێشی (موجتەسسی مەخبون) . بۆ نموونە باسەیرێکی هەر دووکیان بکەین : (موضاریع) کە تەفعیلەی یەکەم‌و سێیەمی (مەقبوض)بێ ، بەلاَم وەکو (خەلیل) ئەلێ (فاع‌لاتن) (سالم)بێ ، واتە تووشی (خەبن) نەبێ ، بەم جۆرەیە :

١ – موضاریع پێش (خەبن) :

مَفاعِلُنْ فاعِلاتُنْ مَفاعِلُنْ فاعِلاتُنْ

∪ – ∪ –   – ∪ – –   ∪ – ∪ –   – ∪ – –

(موجتەسیسش) کە هەر چوار تەفعیلەکەی (مەخبون) بێ ، بەم جۆرەیە :

٢ – موجتەسی مەخبون :

مَفاعِلُنْ فَعِلاتُنْ مَفاعِلُنْ فَعِلاتُنْ

∪ – ∪ –   ∪ ∪ – –   ∪ – ∪ –   ∪ ∪ – –

وەکو ئەیان بینی زۆر لە یەکەوە نزیکن . بەلاَم لەوانەیە گوێ‌یەکی ئاهەنگ ناس ، لێکیان جیا بکاتەوە ، بە هۆی ئەوەوە کە (فاعلاتن)ی کێشی یەکەم (سالم)ەو هی کێشی دووەم مەخبونە : (فعلاتن) . بەلاَم ئەگەر بە قسەی کاك (بهار) بکەین‌و (فاعلاتن)ی کێشی (موضاریع)یش ، بکەین بە (فعلاتن) ئەوا کێشی یەکەمیش بەم جۆرەی لێ‌دێ :

٣ – موضاریع دوای (خەبن) :

مفاعلن فعلاتن مفاعلن فعلاتن

∪ – ∪ –   ∪ ∪ – –   ∪ – ∪ –   ∪ ∪ – –

لە گەلَ کێشی دووەمدا ، واتە (موجتەسسی مەخبون) هیچ جیاوازی‌یەکی نی‌یە ! ! . بۆیە ئەگەر هاتوو دێرە شیعرێکت کێشاو بینیت تەفعیلەکانی (مفاعلن فعلاتن)بوو ، شتێکی سەیر نی‌یە ، کە نەزانی (موجتەسسە) یان (موضاریع)ە ! ! .

بە هەرحالَ ، بۆ ئەوەی نەکەوینە باسی لابەلاوە ، لەوە زیاتر لەسەری ناڕۆم . بەم بۆنەیەوە ئەلێم دیاردەیەکی تریش هەیە ، کە پەیوەندی بە تەفعیلەکانی عەرووزەوە هەیە . ئەویش ئەوەیە : کە ئەم تەفعیلانە گەلێك جار ، پیاو بە هەلَەدا[21] ئەبەن‌و وای لێ‌ئەکەن «کێشێك بە تەفعیلەی کێشێکی کە بکێشی»[22] . من بەش بە حالَی خۆم ، مامۆستایەکی گەورەی



!عەرووزم دیوە ، کێشێکی بە تەفعیلەی کێشێکی کە کێشاوە ! ! ، کە باس کردنی هەڵ ئەگرم بۆ شوێنی تایبەتی خۆی .

لە دوای ئەمانە ، ئەمەوێ گلەییەك لە مامۆستا (بیار) بکەم . مامۆستا لە سەرەتای باسەکەی‌دا لە کێشی (موضاریعی «مەکفوفی» ئەحزەبی مەحذوف)[23] ئەدوێ کە من لە ساڵی (١٩٧١)دا ، لە گۆڤاری (برایەتی)دا برێك لێ‌ی دوابووم[24] . هەرچەندە خوالێخۆش‌بوو (شێخ نوری)ی شاعیر ، پتر لە نیوە سەدەیەك لەمەوبەر ، تەفعیلەکانی ئەم کێشەی لە (ژیان)[25] دا نوسیبوو . بێ ئەوەی ناوی کێشەکە بێنێ ، یاخود (زیحاف)ەکانی شی بکاتەوە . بەڵام وەکو من بیزانم من یەکەم کەس بووم .

بە زمانی کوردی ناوی کێشەکەم هێناوەو زیحافەکانیم بە کورتی شی‌کردۆتەوە ، کە ئەبوو مامۆستا (بیار) هێمایەکی بۆ بکردایە ، وەکو من لە وتارەکەمدا . باسی (شێخ نوری)م کردبوو .

لە کۆتایی ئەم بەشدا پێویستە هەروا بە سەرپێوە بڵێم : ئەو بەیتەی مەلای (کۆیە) کە مامۆستا (بیار) لە کۆتایی کێشی (خەفیف)دا هێنای بۆ ئەکا :

شۆرەژن من لە هەوەڵ‌پێم نەگوتی
ئاخری حەزرەتی شێخ . . . هتد[26]

وە وای پیشان ئەدا کە گوایا (مفاعلن)ی تیادا بووە بە(مفاعیلن) . ئەڵێم ئەو بەیتە چ پەیوەندی‌یەکی بە کێشی (خەفیف)ەوە نی‌یە . بەڵکو تێکرای هەڵبەستەکە لە سەر کێشی (رەمەل)ی شەش تەفعیلەیی‌یە کە هەندێ لە تەفعیلەکانی (مەخبون)و تەفعیلەی دوایی (هەردوو دێرەکە (مەخبون)و (مەحذوف)ە : (فعلن) .

وە خوێندنەوەیەکی شاعیرانە . (وەکو خۆی دەڵێ) دەری ئەخاکە (مفاعیلن) لە بەیتی ناو براودا نی‌یە . کە داخەکەم لەوە زیاتر ناتوانم لەسەری برۆم .

لە کۆتایدا ئەڵێم : سەرەڕای ئەم هەڵانەش . مامۆستا (بیار) تێکرا کێشی (موتەقارەب)و (خەفیف)ی تا رادەیەکی باش شی کردۆتەوە . هەر وەکو لە سەرەتاشەوە دوو کێشی (موضاریع)ی زۆر باش راڤە کردووە .

جگە لەوەی لە هەردوو وتارەکەی (بەیان)[27]و (رۆشنبیری)دا ، گەلێك بیرو ڕاو بۆچوون‌و گەیشتنە ئەنجامی ڕاست‌و دروستی دەربارەی عەرووزو عەرووزی شیعری کوردی ، پیشان داوە ، کە داخەکەم نەم توانی هێمایان بۆ بکەم ، یاخود بڵێم : درێژبوونەوەی باسەکە مەودای ئەوەی نەدام . ئومێدم وایە لەدەرفەتێکی کەدا . بگەڕێمەوە سەریان .

## (کێشی دوو هۆنراوە

بە بۆنەی ئەوەوە کە زۆربەی قسەکانم . دەربارەی کێشی (موجتەسسی مەخبونی مەحذوف)بوو ، لە جێی خۆیایەتی کە بڵێم (کاکەی فەللاح) لە کتێبی (کاروان)دا باسی دوو هۆنراوە ئەکاو وای دەرئەخا کە گوایا کێشەکانیان تازەن . یاخود لەو سەردەمەدا «گوێ بەو جۆرە کێشانە ڕانەهاتووە . . .» . لە کاتێکدا کە هەردووکیان ، لەسەر هەمان کێشی «موجتەسسی مەخبونی مەحذوفن) .جا ئەم بەشەی وتارەکەم بریتی‌یە لەڕاست کردنەوەی ئەم هەڵەیە .

بەڵام لە پێش ئەوەدا دەرگای ئەم باسە بخەمە سەر پشت . پێویستە بڵێم : ئەمەی من لێرەدا ئەینوسم ، لە گەڵ قسەی مامۆستا (گۆران) خۆی‌دا ، یەك ئەگرێتەوە ، کە ئەڵێ (لەو

ماوەیەدا کێش هەر عەروزووبووە)[٢٨] . کە مەبەستی لەو ماوەیە ئەو سەر دەمەیە کە شیعری ناوبراوی تیادا وتووە .
واتە سەردەمی دەستەی «شێخ نووری» کە - گۆران - خۆی یەکێک بوو لەوان . لە بەر ئەوە ، ئەمەی ئێرەدا ئەینووسم تەنیا بۆ راستکردنەوەی هەڵەیەکی (کاکەی فەللاح)ە ، نەك رەخنە گرتن لە خوالێخۆشبووان (شێخ نووری)و (گۆران) .
دوای ئەم سەرەتایە ، بابچینە ناو جەرگەی باسەکەوە . (کاکەی فەللاح) لە کتێبی (کاروان)دا . لە پاش ئەوەی بە درێژی باسی دەستەی (شێخ نووری)و هاوڕێکانی ئەکا[٢٩] . ئەمجا دێتە سەر باسی شیعری «جلوەی شانۆ»ی (گۆران)و «ژیانی ئادەمزاد»ی (شێخ نووری)و ، بە چاکترین نموونە نوێ کردنەوەیان دائەنێ ، لە رووی (وێنەو وەصفو شێوازو دەربڕینو هەستو . . .)[٣٠])ەوە ، کە بێگومان ئەم قسانە هەموویان بە بێ چەندو چوون راستن . بەڵام ئەوەی کە سەرنج رائەکێشێ ئەوەیە : کە دوای ئەم دوو شیعرە ئەڵێ : (پێش ئەم هەنگاوە گوێ بەم چەشنە مۆسیقاو کێشانە رانەهاتبوو . .)[٣١] ! ! . واتە : بە پێی ئەم قسەیە . ئەبێ ئەو کێشانە تازەبن ، چونکە کە وتمان گوێ بە فلان کێش رانەهاتووە ، مەعنای ئەوەیە ، یان هەرگیز نەبیستراوە ، یان تازە بەرگوێ کەوتووە . واتە گوێ راهاتن بە کێشێك لەوەوە پەیدا ئەبێ کە زۆر بەرگوێ بکەوێ .
لەم ڕووەوە (د . ئیبراهیم ئەنیس)[٣٢] ئەڵێ : «خۆش بەر گوێ کەوتنی کێشەکان ، خوو پێوە گرتنە کە لە زۆر بیستنەوە پەیدا ئەبێ» . جا لەبەر ئەمە کە (کاکەی فەللاح) ئەڵێ : (گوێ بەم کێشانە رانەهاتبوو . . !) ، مەعنای ئەوەیە : ئەم کێشانە بەر گوێ نەکەوتوونو تازەن ، لە کاتێکدا هەردووکیان لە سەر هەمان کێشی (موجتەسسی مەخبونی مەحذوفن) ، کە نەك تەنیا شاعیرانی وەکو (نالی)و (حاجی)و (مەحوی)و (ئەدەب)و (زێوەر)و (بێخود)و (شاهۆ)و (رەمزی) . . . شیعریان لەسەر داناوە ، بەڵکو شاعیرانو شیعر دۆستانی کورد ، ساڵەهای ساڵ



پێش ئەوانیش ، لە رێی شیعرەکانی ((سەعدی)و (حافظ)ەوە ، ئەم کێشەیان بیستوەو گوێیان بە ئاهەنگی راهاتووە . بۆ راستی ئەم قسەیە . با لە (جلوەی شانۆ)وە دەست پێبکەین :

لە جەرگی پەردەوە تك تك . دڵۆپی عود ئەڕژا
بە نووکی تەئثیری
تەرەب ئەهاتە خرۆش ، تالعی سرور ئەپژا !
بە ئاهی دڵگیری[٣٣]

کە کەرت کردنی بەم جۆرەیە :

| ئەڕژا | دڵۆپِ عود | دەوە تك تك | لە جەرگِ پەر |
|---|---|---|---|
| ◡ ◡ — | — ◡ — ◡ | — — ◡ ◡ | ◡ — ◡ — |
| فِعْلُنْ | مَفاعِلُنْ | فَعِلاتُنْ | مَفاعِلُنْ |

| سیری | بە نووكِ تەئـ |
|---|---|
| — — | ◡ — ◡ — |
| فِعْلُنْ | مَفاعِلُنْ |

| ئەپژا[٣٤] | لعی سرور | تەخرۆش تا | تەرەبِ ئەها |
|---|---|---|---|
| ◡ ◡ — | — ◡ — ◡ | — — ◡ ◡ | ◡ — ◡ — |
| فِعْلُنْ | مَفاعِلُنْ | فَعِلاتُنْ | مَفاعِلُنْ |

| گیری | بە ئاهِ دڵ |
|---|---|
| — — | ◡ — ◡ — |
| فِعْلُنْ | مَفاعِلُنْ |



(گۆران)

وەکو ئەبینی لەسەر کێشی (موجتەسسی مەخبونی مەحذوفە) ، وە ئەگەر شتێکی تازەی لە رووی کێشەوە تیابێ ، ئەو دوو تەفعیلەیەیە کە لە دوای هەر دێرێکەوە زیاد کراوەو پێ‌ی ئەوترێ (موستەزاد) . بەڵام وەکو ئەبینی ئەوانیش تازە نین ، چونکە دوو بارە کردنەوەی تەفعیلەی سێ‌یەم‌و چوارەمی کێشەکەن ، کە هەندێ جار ئەمی چوارەمیان ئەبێ بە : (فیعلون – –) .

هەرچۆن بێ ، ئەگەر چاو لە (جلۆەی شانۆ) بپۆشین چونکە ئەو موستەزادەی تیادایە ، ئەی بۆ (ژیانی ئادەمزاد) ئەبێ چی بڵێین کە ئەوەشی تیانی‌یە ، بەڵکو (موجتەسسێکی – مەخبونی مەحذوف)ی رووتە ؟ . بۆ نمونە با بەیتی یەکەمی ئەویش کەرت بکەین :

به ناو شەپۆلی خەما ، سەرنگوونو بێ ئارام ،
بە کێوی سەختی ژیانا ، بە پێ ، بە چنگە رنێ

کەرت کردنی بەم جۆرەیە :

| | | | |
|---|---|---|---|
| بەناوشەپۆ | لِخەماسەر[٣٥] | نگونُبێ | ئارام |
| ᴗ — ᴗ — | ᴗ ᴗ — — | ᴗ — ᴗ — | — — |
| مفاعلن | فعلاتن | مفاعلن | فَعْلانْ |
| بەکێوسەخ | تژیانا | بەپێ‌بەچن | گەرِنێ |
| ᴗ — ᴗ — | ᴗ ᴗ — — | ᴗ — ᴗ — | ᴗ ᴗ — |
| مفاعلن | فعلاتن | مفاعلن | فَعِلنْ |

دوای ئەوەی کە بۆمان دەرکەوت هەر دوو شیعرەکە لەسەر هەمان کێشی (موجتەسسی مەخبونی مەحذوفن) کە کێشێکی عەرووزی‌یە ، ئەمجا دێمە سەر ساغ کردنەوەی ئەوە : کە ئەم کێشە لە زۆر کۆنەوە لە شیعری فارسی‌داو دواتر ، لە شیعری کوردی‌دا ، بەکار هێنراوە .

هەرچەندە ئەتوانم لە (سەعدی)و (حافظ)ەوە پیا بێم ، تا ئەگاتە شاعیرانی هاوچەرخی (شێخ نوری)و (گۆران) ، وە بۆ هەریەکێکیان نمونەیەك بێنمەوە . بەڵام کارێکی‌وا ، بروانا کەم شتێکی پێویست بێ ، جگە لەوەی کە باسەکەمان بە خۆڕایی درێژ ئەکاتەوە بۆیە بە شیعرێکی (حافظ)و ، یەکێکی (بێخود) واز دێنم . لەبەرئەوەی یەکەمیان لە رێبازی کلاسیکی‌دا ، بە ناو بانگ‌ترین شاعیری فارسی زمانەو دووەمیشیان : (بێخود) ، جگە لەوەی شاعیرێکی گەورەی ئەو رێبازەیە لەم چەرخی دواییەدا لە هەمان کاتدا ، هاوچەرخی (شێخ نوری)و (گۆران)یشەو بە تەمەن لە هەردووکیان گەورەترە .

١ – حافظ ئەڵێ :

شبی کەماه مراد از افق شود طالع
بود کە پر تو نوری بیام ما افتد[٣٦]

کە بەم جۆرە کەرت ئەکرێ :

| | | | |
|---|---|---|---|
| شەبی‌کی‌ما | هیمورادەز | ئوفوق شەوەد | طالیع |
| ᴗ — ᴗ — | ᴗ ᴗ — — | ᴗ — ᴗ — | — — |
| بوە دکی پەر | تەوی نووری | بە بامی ما | ئوفتەد) |
| ᴗ — ᴗ — | ᴗ ᴗ — — | ᴗ — ᴗ — | — — |
| مفاعلن | فعلاتن | مفاعلن | فِعْلن |

٢ – بێخود[٣٧] ئەڵێ :

کە لێوی گوڵ بە هەناسەم ئەگا ئەڵێ‌ی ئاخۆ
چ خونچەیێکە بە دەم بای صەباوە پێ ئەکەنێ

کە بەم جۆرە کەرت ئەکرێ :

| | | | |
|---|---|---|---|
| کەلێوگِوڵ[٣٨] | بەهەناسەم | ئەگائەڵێ‌ی | ئاخۆ |
| ᴗ — ᴗ — | ᴗ ᴗ — — | ᴗ — ᴗ — | — — |
| مفاعلن | فعلاتن | مفاعلن | فِعْلن |
| چ خونچەیێ | کەبەدەم‌بای | صەباوەپێ | ئەکەنێ |
| ᴗ — ᴗ — | ᴗ ᴗ — — | ᴗ — ᴗ — | ᴗ ᴗ — |
| مفاعلن | فعلاتن | مفاعلن | فَعِلن |

شایانی باسە ، کاك (بیمار) کاری راست‌بێ ، شیعرێکی (نالی)و یەکێکی (حاجی) بۆ کەرت کردوین وە (تەفعیلە)کانی



«شێخ نووری»

بەراستی نووسیوە[٣٩] ، بەڵام ئەوەندە هەیە ، ئەو بە (موضاریعی) زانیوە ، لە کاتێکدا کە هەردووکیان لەسەر هەمان کێشی (موجتەسسی مەخبونی مەحذوف)ن . جا لە دوای ئەم بەڵگانە ، بۆم هەیە بپرسم : کێشێك ئەوەندە کۆن بێ ، شاعیرانی وەکو (سەعدی)و (حافظ)و دوای ئەوان هی وەکو (نالی)و (حاجی)و (مەحوی) ، شیعریان پێ گوتبێ ، وە شاعیرانی هاوچەرخی وەکو (زێوەر)و (بێخود)و (ڕەمزی) . . . بەکاریان هێنابێ ، چۆن بەم کێشە ئەوترێ ، (گوێی پێ ڕانەهاتووە) ؟ . یاخود بە واتایەکی کە : کەسێك شارەزای کێشی ئەم شیعرانەبێ ، چۆن ئەتوانی قسەی وابکا ؟ .

دوای ئەم ڕوون کردنەوەیە ، ئەمجا ئەگەر بمانەوێ — وەکو کاکەی فەللاح — باسی ئەو (ئاهەنگانە) بکەین ، کە گوێی پێ ڕانەهاتبوو لە شیعری دەستەی ناوبراودا : (دەستەی شێخ نوری‌و هاوڕێکانی) ، ئەبێ پەنجە بکێشین بۆ ئەو (تێهەڵکێشان)ەی تێکەڵاویان ئەکرد ، لە گەڵ کێشە (عەرووزی)یەکاندا ، کە چاکترین نموونەی ئەم جۆرە (ئاواتی دووری)ی (گۆران)ە :

ئەی چاو ! چەشنی بازی قەفەس هەڵوەرێ پەرت ،
کوا باڵە تیژەکانی نیگای حوسنی دولبەرت . . . ؟

**کوانێ دوو چاوی مەست ؟ کوانێ ؟**
**کوانێ بڕۆی پەیوەست ؟ کوانێ ؟**
**کوانێ زوڵفی ڕەش ؟**
**کوڵمی ئاڵ‌و گەش ؟**
**کوا هەیکەلی جەمال ؟**
**کوا حوسنی بێ میثال[٤٠] ؟** . . . هتد

کە لە پێنج کۆپلەی وەکوو ئەوەی سەرەوە پێکهاتووە سەرەتای هەر کۆپلەیەك ، بە کێشێکی عەرووزی دەست پێ دەکاکە : (موضاریعی ئەخرەبی مەکفوفی مەحذوف)[٤١] ەو بە شەش دێرە شیعری بچووك دوایی دێ ، کە لە ڕووی کێشەوە شتێکی تازەن‌و هیچ پەیوەندی‌یەکیان بە کێشی (موضاریع)ەوە نی‌یە لەوانەیە یەکەم هەنگاو بێ بۆ تێکەڵ کردنی کێشی عەرووزو کێشی پەنجە ، یاخود هیچ نەبێ یەکێك بێ لە هەنگاوە سەرەتایی‌کانی ئەم بابەتە . لە گەڵ ئەوەش‌دا ، دەربارەی ئەمیش ناتوانین بڵێین : گوێی پێ ڕانەهاتووە بەڵکو ئەگەر بمانەوێ دەربڕینێکی پڕ بە پێستی ورد بەکار بێنین ، ئەبێ بڵێین : هەرچەندە سەرەتای هەر کۆپلەیەك بە کێشێکی عەرووزی دامەزراوە ، بەڵام موتوربەکراوە بە چەند تێهەڵکێشێك یان دێرە شیعرێك کە لەوەپێش نەبیستراون ، یاخود گوێیان پێ ڕانەهاتووە .

## پەراوێزو سەرچاوەکانی ئەم باسە

(١) بڕوانە گۆڤاری : (ڕۆشنبیری نوێ — ژمارە — ١١٠ — حوزەیرانی / ١٩٨٦ — ل ٧٨ — — ٨٤) .

(٢) خانمی دکتۆر (بهيجة الحسنى) دەڵێ : لە پەراوێزی (الارشاد الشافي)دا نوسراوە : (المسموع من المشايخ فتح الراء . . .) واتە : لە مامۆستایانی پیر «موتەقارەب» بیستراوە . نەك «موتەقاریب» . بڕوانە :

(القسطاس المستقيم في علم العروض — للزمخشري — الناشر — مكتبة الاندلس — بغداد — ١٩٦٩ — ل — ٢٢٢ — پەراوێزی ژمارە —١—) . کە خانمی ناوبراو ساغی کردووەتەوەو پەراوێزەکانی نوسیووە .

(٣ — ٤) (ڕۆشنبیری نوێ — هەمان ژمارەی پێشوو — ل ٧٨ — ستوونی — ٢— خاڵی — ٢ — وە — ٤) . شایانی باسە من لەو دەراسەتەدا کە بە دەستمەوەیە دەربارەی عەرووز . ئەو نیشانەم بەکار هێناوە . بەڵام ئەو بڕگانەم بە درێژ داناوە . کە زۆر تر ئەکەونە کۆتایی دێرە شیعرەکانەوە . وەکو : (بار — زێر — کێو . . . هتد) وە ئەم نیشانەیەم : ( ە) بۆ داناوە . لەبەر ئەوە ئەم نیشانەیە (—) کە (بمار) بە درێژی دائەنێ . من بە بڕگەی ناوەڕاستی دائەنێم .

(٥) هەمان ژمارەی (ڕۆشنبیری نوێ — ل ٨٠ — خاڵی — ٣ — ل ٨١ — خاڵی — ٤) .

(٦) سەرچاوەی پێشوو — ل — ٨١ خاڵی — ٤ — ستوونی (١)

(٧) سەرچاوەی پێشوو — ل — ٨١ — خاڵی — ٤ ستوونی (١) .

(٨) سەرچاوەی پێشوو — هەمان لاپەڕە — خاڵی — ٤ ستوونی (٢) .

(٩) سەرچاوەی پێشوو — ل — ٨١ خاڵی — ٤ — ستوونی (١) .

(١٠) بڕوانە : شمس الدين الرازي المعجم في معايير اشعار العجم — تصحيح مدرس رضوي — چاپ افست رشديه — تهران — ١٣٣٨ ی‌خۆری — ل — ١٥٦ بحری مجتث) . کە لەمەودوا بە : (المعجم) هێمای بۆ ئەکەم .

(١١) بڕوانە : (د . خانلری — وزن شعر فارسی ١٣٤٥ —ی‌خۆری تهران — ل — ل ١٩٠—١٩١ دائرەی سێیەم — بحری شەشەم : اجتث اخبون) هەروا : (سەرچووەی پێشوو — المعجم هەمان لاپەڕە) .

(١٢) بڕوانە : (الصاحب بن عباد – الاقناع في العروض وتخريج القوافي تحقيق الشيخ محمد حسن ال ياسين – الطبعة الأولى – منشورات المكتبة العلمية – مطبعة المعارف بغداد ١٩٦٠ – ل – ٦٨-٦٩).

(١٣) بڕوانە : (فرصت شيرازى – بحور الالحان – چاپخانەی ارژنگ تهران ١٣٤٥ ی خۆری – بحر مجتث مخبون – ل – ٥١).

وام بەڕاستتر زانی کە شیعرەکە لە پێشا وەکو خۆی بنوسم . واتە جۆری نوسینی دەستکاری نەکەم .

(١٤) مامۆستا (بهار) لە وتاری (ساغ کردنەوەی دیوانی حاجی قادری کۆیی)دا . هەرچەندە . لە شیعرێکی (حاجی)دا کە لەسەر ئەم کێشەیە . (تەفعیلە)ی یەکەم بە (مفاعیلن) ئەزانێ . بەڵام بۆ خوێندنەوەی هەمان ڕێگە پێشنیار ئەکاو ناوی ئەنێ : (خوێندنەوەی شاعیرانە) . بڕوانە : گۆڤاری (بەیان – ژ – ١٢٠ – حوزەیرانی – ١٩٨٦ – ل – ١٩ – ستونی «٢»).

(١٥) بڕوانە : (وزن شعر فارسی – سەرچاوەی پێشووتر – ل – ٢٣٥ – بەحری شەشەم وەزنی – دووەم) .

(١٦) شایانی باسە لە عەرووزی فارسیدا کە (فاعلاتن) تووشی (حەذفو قەطع) بێ پێی دەڵێن : (صەلم) . بڕوانە : (المعجم – ل –٥٣) . بەڵام لەبەر ئەوەی (صەلم) لە شیعری عەرەبدا . مەعنایەکی کەی هەیە . بۆیە بەکارهێنانی (بەتر)م بە باشتر زانی . تا ئەوانەی شارەزای عەرووزی شیعری عەرەبین . سەریان لێ تێك نەچێ .

(١٧) شمس الدين محمد بن قيس الرازى « خاوەنی – المعجم – لە پێشترا باس کرا . بڕوانە پەراوێزی ژمارە (١٠) .

(١٨) وحیدی تەبریزی – رسالەی جمع مختصر – اکادمی علوم لە یەکێتی سۆڤیەت – کۆلێجی – خۆرهەڵات ناسی – مۆسکۆ – ١٩٥٩ – بە کۆشش و تەقەلای – ئاندەر برتلیس – ل – ٨٢ – ٨٥) .

(١٩) د . پەرویز ناتل خانلەری – دانەری – وەزنی شیعری فارسی – لە پێشتردا باس کرا . بڕوانە : پەراوێزی ژمارە (١١) .

(٢٠) د . ابراهیم انیس نکوول لەوە دەکا کە (فاعلاتن) بەم جۆرە بنوسرێ : (فاع لاتن) . بڕوانە : (موسيقى الشعر – چاپی چوارەم – مكتبة الانجلو المصرية – المطبعة الفنية الحديثة – بالزيتون – ١٩٧٢ – ل – ٥٣) .

(٢١ . ٢٢) بڕوانە : (حكمة فرج البدري – العروض في أوزان الشعر العربي وقوافيه – مطبعة دار البصرى – بغداد – ١٩٦٦ – ل – ٤١ – باسی : «الاجزاء الشعرية» لە گەڵ : «أجزاء الخليل . . . » .

(٢٣) بڕوانە : (ڕۆشنبیری نوێ – هەمان ژمارە – ل – ٧٩ – ستونی – ٢ – خاڵی – ١) .

کاك (بهار) زاراوەی (مەکفوف) پێش (ئەخرەب) خستووە . کە ئەبوو (ئەخرەب) پێش بخستایە . چونکە لەم کێشەدا . تەفعیلەی یەکەم (ئەخرەب)ەو هی دووەم و سێیەم (مەکفوف)ە .

(٢٤) بڕوانە : گۆڤاری (برایەتی – ١٠ – ساڵی یەکەم – خولی دووەم – کانوونی دووەمی – ١٩٧١ – ل – ٩) هەروەها (پەراوێزەکانی ژمارە «١٨»و «١٩»و «٢٠»و «٢١»و «٢٥»ی لاپەرە – ١٣ – و –١٤) . شایانی باسە من وتاری ناو براوم لەپێش ساڵی (١٩٧٠)دا . بۆ پۆلی سێیەمی ناوەندی نووسیبوو . بڕوانە : (زمان و ئەدەبی کوردی – چاپی یەکەم – ١٩٧٠ – ل – ٧٣ – ٨٠) بەڵام کەدیم سەروگوێلاکی شکێنرابوو . لەبەر ئەوە ناچار بووم . دەقی وتارەکە لە برایەتیدا بڵاو بکەمەوە .

(٢٥) بڕوانە : (ژیان – ژمارە – ٣١ – ٢ – ی ئەیلوولی – ١٩٢٦ – ساڵی یەکەم) .

هەروەها : (شێخ نوری شێخ صالح – د . کامل حسن البصیر – ل – ٣٩) .

(٢٦) هەمان ژمارەی (ڕۆشنبیری نوێ – ل – ٨٤ – کۆتایی ستونی (١) .

(٢٧) بڕوانە : پەراوێزی ژمارە (١٤)ی ئەم وتارە

(٢٨) (کاروانی شیعری نوێی کوردی – بەرگی یەکەم کاکەی فەللاح چاپخانەی کۆڕی زانیاری کورد – بەغدا – ١٩٧٨ – ل –٣٠) .

کە لەمەودوا بە (کاروانی شیعر) ناوی ئەبەم .

(٢٩) (سەرچاوەی پێشوو – ل – ٢٦ – ٢٩) .

(٣٠) (سەرچاوەی پێشوو – ل ٢٩–٣٠) .

(٣١) (سەرچاوەی پێشوو – ل /٣٠) . ئەمەی لێرەدا ئەینوسم خاڵێکە لە وتارێك . لە کاتی خۆیدا . لە وەڵامی (کاکەی فەللاح)دا نووسیبووم . ئەوانی کەی هەڵ ئەگرم بۆ دەرفەتێکی تر .

(٣٢) (موسيقى الشعر – ل – ٥٥)

(٣٣) (سەرجەمی بەرهەمی گۆران – بەرگی یەکەم – بە کۆششی : محمدی مەلاکریم بغداد – ١٩٨٠ – ل – ١١٠) . تەفعیلەی یەکەمی دێڕی یەکەم : (لە جەرگی پەڕ) ب – لە کێشی (هەزەج)دا . ئەبێ بە (مفاعیلن) ب – – – . بەڵام لێرەدا ئەبێ بزوێنی (گ) کورت بکرێتەوە هەتا ئەبێ بە : (لە – جەر – گ – پەڕ) – ب ب (م – فا ع لن) ب ب – . لەبەر ئەوە لە کەرت کردنیشدا بەو جۆرەم نووسیوە : (لە جەرگ پەڕ) . دیارە ئەمە پێش نیارێکە من پەیڕەوم کردووە بەڵام مەرج نیە خوێندەواری خۆشەویست پەیڕەوی بکا .

(٣٤) کاك (بهار) مستەزادەکەی لێ دەرچێ کەنەی کێشاوە باقی بەیتەکەی بە ڕاستی کێشاوە . بەڵام ئەو بە (موضاریع)ی زانیوە . کە لە ڕاستیدا (موجتەسسی مەخبونی مەحذوفە) . بڕوانە (ڕۆشنبیری – ژمارەی پێشوو – ل – ٨١ – ستونی – ١ و٢٥) .

(٣٥) تەفعیلەی دووەمی دێڕی یەکەم : (لی خەماسەر) لە کێشی (ڕەمەل)دا ئەبێ بە (فاعلاتن) . هەروەکو ئەتوانی لێرەشدا هەر بەو جۆرە بیکێشی کاك (بهار)یش . تەفعیلەی دووەمی بەیتێکی (حاجی قادر)ی بە (فاعلاتن) کێشاوە : (هەمان ژمارەی ڕۆشنبیری – ل – ٨١ – ستونی –١– پاشماوەی خاڵی – ٣ ) ئەم تەفعیلەیە لە شیعری عەرەبدا . وەکو ئەوانی کە . هەمیشە لە گۆڕاندایە . بەڵام بەلای منەوە لە شیعری کوردی و فارسیدا هەمیشە (مەخبون)ە . لەبەر ئەوە لێرەدا بزوێنی (لامە) کە (لی خەماسەر) کورت کراوەتەوە . بووە بە (ل خەماسەر = فعلاتن) . هەروەها تەفعیلەی دووەمی دێڕی دووەمیش (تی ژیانا = ت ژیانا = فعلاتن) .

(٣٦) بڕوانە : (دیوانی « خواجە شمس الدین محمد حافظ شیرازی – چاپی پێنجەم ١٣٤٣ – ی خۆری – مطبوعات – امیرکبیر – تهران – ل – ٩٢ .

وام بە باشتر زانی لە پێشا جۆری نووسینی دیوانەکە تێك نەدەم . هەوڵمدا بەیتەکە لەسەر هەمان کێش بە شیعر بکەم بە کوردی . ئەمەی خوراەوەدەرچوو (جانازانم سەرکەوتوم یانا ؟) .

**شەوێ کە مانگی مرواریێ لە دەم کەلێ هەڵهات .**

**بلێی کە پرتەوی شەوق لەبانی ئێمە بدات ؟**

(٣٧) (دیوانی بێخود – بە کۆششی « محمدی مەلا کەریم – بەغدا – ١٩٧٠ – ل –١٢٤) .

(٣٨) تەفعیلەی یەکەم : (کە لێوی گوڵ) لە دێڕی یەکەمدا . ئەگەر لە کێشی (هەزەج)دا بێ یەکسانە بە (مفاعیلن) ب – – – . بەڵام لەم کێشەدا . (واو)ی (لێو) بە بڕگەیەکی کورت حساب ئەکرێ هەتا ئەبێ بە (مفاعلن) . بڕوانە : پەراوێزی ژمارە (٣٣) .

(٣٩) هەمان ژمارەی : (ڕۆشنبیری نوێ – ل – ٨١ ستونی «١» پاشماوەی خاڵی «٣») .

(٤٠) (سەرجەمی بەرهەمی گۆران – ل – ١٣) . لە دیوانەکەدا هەڵوەری نووسراوە . لای من (هەڵوەرێ) ڕاستترە .

(٤١) بڕوانە : وتاری : (سێ کێشی عەرووزی – بهار – ڕۆشنبیری نوێ – ل – ٨٠ – ستونی –١– ژمارەی پێشوو) ، هەروەها (کێش لە شیعری کوردیدا – گۆڤاری برایەتی – ژمارەی پێشوو – ل –٩– نووسینی : خاوەنی ئەم وتارە) .

علی فتاح دزەیی

# بابەتی ناوەرۆك و فۆرمی مەم و زین

«تێبینی : بۆ بەشەکانی دیکەی ئەم لێکۆڵینەوەیە ، لەبارەی (خانی‌و مەم‌و زین) ، بنوارە ژمارە (٤٦)ی گۆڤاری کاروان لاپەرە ، ٣١ .»

## ١ - بابەتی ناوەرۆکی مەم‌و زین

هەر ووشەیێك لە ، بنەرەتدا لەدوو بەشان پێکهاتوە ، بەشی یێکەم واتای ووشەکەیەو ، بەشی دووەمیش ، ئەو دەنگانەیە ، کە ووشەکە دەدرکێنن‌و واتاکەی رادەگەیێنن .

بۆ هەر دەنگێکیش جۆرە نیشانەیەك دادەندرێ ، پیێ دەگوترێ پیت (حرف) ، بۆ ئەوەی ووشەکەی پیێ بنووسرێتەوە . کەواتا مەبەست‌و واتای ووشە ، ناوەرۆکیەتی‌و پیتەکانیشی فۆرم قالبەکەیەتی .

هەر وها ، هەر کردارێکی ئەدەبی ، لە دوو بەشان پێکدێ ، بەشی یێکەم ناوەرۆك‌و هی دووەم فۆرمەکەیەتی . قالب‌و فۆرمی کرداری ئەدەبیش ، یان پەخشانە ، یان هەڵبەست .

ئەوەی شیعرو هەڵبەستیشی ، لە پەخشان هەڵداوێرێ ، شێوازو کێش‌و قافیەیە ، کە فۆرمی ئەم بابەتە پێکدەهێنن ، دەنا گەلێك جۆرە پەخشانیش ، ناوەرۆکی شیعریان هەیە . هەڵبەت ، وێژەو ئەدەبیات ، بەرهەمی مێشکی مرۆڤە ، بۆیێکە لە هەر قۆناغێکی مێژوویی‌ی کۆمەڵانی مرۆڤدا ، جۆرە ئەدەبێك هاتۆتە بەرهەم ، کە لە لایەنی ناوەرۆك‌و فۆرمەوە ، لە ئەدەبیاتی قۆناغی پێشووتر جودایە . ئەمجا ، لەبەر ئەمە دەبیێ کرداری ئەدەبی ، بە سەنگ‌و تەرازووی ئەو کات‌و شوێنە کێشانە بکرێ ، کە هێناویێانە بەرهەم .

(ئەرستۆ)ی دانا ، شیعری یۆنانی‌ی لە لایەنی ناوەرۆك‌و فۆرمەوە ، کردوە بە چوار بابەت : (١ - ئیپیك ، ٢ - تراژیدی ، ٣ - کۆمێدی ، ٤ - دیترمبۆس)[1] .

لە سەدەی پازدەم‌و شازدەم بەدوواوە ، لە پاش ئەوەی نەتەوەکانی ئاوروپایی ، لە باتی زمانی لاتینی = (زمانی رۆمانەکان) زمانی نەتەوەیی خۆیانیان کرد بە زمانی ئەدەبیاتیان ، شاعیرەکان‌و نووسەرەکانیان ، بۆ سەرچاوەکانی ئەدەبی‌ی یۆنانی‌و رۆمانی گەراونەتەوەو ، کەرستەی نووسینیان لەوانەوە ، خواستۆتەوە . ئەوەندەش ، گیرۆدەی ئەو ئەدەبیاتە کۆنانە ببوون ، کە بەبیێ پەروا ، ناوەرۆك‌و فۆرمی ئەوانیان کردوە بە سەرمەشق‌و شاعیرو نووسەرەکانی ئەوانیشیان . بە سەردەستەو بە چین (کلاس)ی یێکەم داناوە . بۆیێکە ،ئەم بزووتنەوەو ئەم بابەتەتازەی ئەدەبیاتە ناوی (کلاسیك)ی لیێوەنراوە .

ئەدەبی کلاسیکیش ، ئەدەبێکی مەوزووعی بوە ، واتا ، شاعیر یان نووسەر ، ناوەرۆکی نووسینەکەی ، لە دەرەوەی (خودی خۆیدا) دەخوازتەوە . هەمیشە ناوەرۆکێکی ئەوتۆی دەخستەروو ، کە نموودو تابعێکی گشتی‌و بەردەوامی هەبێت‌و

بۆ هەموو کاتو شوێنان دەستبدا . کەسەکانی شیعرو داستانەکانیشی ، لە جیاتی (خواکانو پەریزادەکان)ی ئەفسانەیی شازادەو سوارچاکەکان بوون . زمانو ووشەکانی بەرهەمەکانیشی ، بە هەموو جۆرە هونەرەکانی بەلاغەت دەرازاندەوە .

ئەو بزوتنەوە ئەدەبییەی پێشکەوتنخوازە ، لە ئەنجامدا ، شێوەیێکی دۆگمایی (= باوەڕیی ووشك) ، وەرگرتوەو ، لە چوارچیوەو قالبێکی رەقوتەقدا جیگیربوە[۲] .

لە سەدەی حەڤدەم بەدوواە ، بە تایبەت لە دووای شۆرشی گەورەی فەرەنسا (ساڵی – ۱۷۸۹) ، کە کەسایەتیی مرۆڤی تاك هاتە مەیدانو ماڤی مرۆڤ (حقوق الإنسان) ئاشکراکرا ، بەرهەمی ئەدەبیش ، نەك هەر کارلێکەر ، بەڵکو کارلێکراوی ئەم گۆرانە گەورەیەو ئەم بە پێشوەچوونەی بیری مرۆڤیبوە .

بۆیێکە ، شاعیرانو نووسەرانی ئەو سەردەمە ، بەرامبەر بە کۆتو بەندی ئەدەبی کلاسی وەستاونو ویستوویانە پێش هەر شتێك ، پڕ لە ورووژانی دەروونیو لە هەستو لە خەیالاتی خۆیان بکەن . واتا بە چەشنێکی وها بنوارنە دەرەوەی کەسایەتیی خۆیان ، وەکو خودی خۆیان دەبینن ، نە ، وەکو چۆن دەرەوەکە هەیەو خۆی دەنوێنێ . ئەم بزووتنەوەیەش ، بە ناوی ئەدەبی (رۆمانسی) ناوبانگی سەندوە[۳] .

ئەمجا ، لە سەدەی نۆزدەمەوە ، کە شۆرشی پیشەسازی رەگی داکوتاو چینێکی خاوەن سەرمایە ، دەسەلاتی سیاسیی لە وولاتەکانی ئاوروپیدا پەیداکردو ، هەتا دەسەلاتیان بۆ دەرەوەی ئاوروپاش ، تەشەنەی کردو ، بەرامبەر بەم چینەس ، چینێکی هەژارو بێ دەرامەت پەیدابوو ، کە بە ئارەق رشتنی رۆژانەی ، پێداویستەکانی ژیانێکی ئاسایی هەر ئەوەتە پەیدا دەکرد ، دیسان ، لەم هەلو مەرجە تازانەی کۆمەلانی خەلکا ، ناوەرۆکی مەوزووعیی باوی سەندەوەو بیری لایەنگیریو ئیلتزام ، سەری هەڵداو ئەمەش ، بزووتنەوەی ئەدەبی واقیعی (= ریالی)ی بەرپاکرد . بەلام ، بەرامبەر بەم بزووتنەوەیەش ، گیانی مرۆڤی تاکو بیری سەربەستی ، هاتۆتەوە مەیدانو لە بزووتنەوەی (سیریالی)و (وجوودی)دا خۆی نواندۆتەوە .

ئیتر بەگوێرەی ئەم روونکردنەوەیە شیعری ئاوروپیو رۆژئاوایی لە لایەنی ناوەرۆکەوە ، کراوە ، بە دوو بابەت ،
یێکەم – بابەتی مەوزووعی ، کە شیعری چیرۆکیو درامییە .
دووەم – بابەتی زاتی ، کە هەموو جۆرەکانی شیعر وەسفیو دڵداریو ویژدانی دەگرێتەوەو لە ژێر ناوی لیریك (Lyric)دا ، کۆ دەکرێنەوە .

راستییەکەی ، ئەم چەشنە دابەش کردنەش ، ئەوەندە تەواونیە کە رەخنە هەڵنەگرێ ، چونکە هیچ بابەتێکی شیعری مەوزووعی ، بەبێ خەیالاتو هەستیو ورووژانی دەروونیی شاعیر نابێ . هەر وها ، بەشی هەرەزۆری بابەتەکانی شیعری ویژدانیو چاکترینی ئەو بابەتە ، ئەو شیعرانەن ، کە پڕ لە هەستو خواستی رەگەزی مرۆڤایەتی دەکەن ، نە ، مرۆڤێکی تاکو تەنیا[٤] .

ئەمجا ، گەر بەم رامانەوە سەیری (مەمو زین) بکەین ، دەبینین لە لایێکەوە ، مەوززعەکەی بیرێکی گشتییە لە بارەی زۆرانبازی لە نێوانی (چاکی)و (بەدی)دا . بەخشی عاتفەی بەرزی خۆشەویستیی کێشاوە ، نە سەربردەی ئەڤینی دڵدارو دلبەرێك . کەسەکانی داستانەکە هەموویان شازادەو لاوچاکەکانی بارەگای (میر)ن . لەسەر تا پایانیشی ، بە هەموو چەشنە هونەرەکانی بەلاغەت رازاوەتەوە .

کەچی ، لە لای دیکەوە ، بەراستیو رەوانی ، پڕ لە بیرو باوەڕیو لە ورووژانی دەروونیی شاعیرەکە دەکا .

کەواتا ، بە پێی ئەم لێکدانەوەیە ، دەبێ (مەمو زین) ، بە بابەتێکی (مەوزووعی – زاتی) ، یاخود بە چیرۆکێکی (کلاسی – رۆمانسی) لە قەلەم بدەین . بەلام ، بابەتەکەی هەرچۆنێك بێ ، ئەوە ئاشکرایە ، کە لە جوانترین فۆرمی شیعری کلاسیدا ، دارژراوەو شی کردنەوەی فۆرمو قالبی

شیعریش ، پێویستی بە باسکردنی ، شێوازو کێش‌و قافیەو هونەرەکانی بەلاغەتەوە هەیە[٥] .

## ٢ - شێوازی چیرۆکی‌ی مەم‌و زین

واتای (شێواز = اسلوب) ، چۆنیەتی‌ی دەربڕینی بیرو رامانی هونەرمەندە . شێوازی چاکیش ، ئەو شێوازەیە ، کە بەراست‌و رەوانی ، مەبەستی هونەرمەند دەخاتە رووو بە خەڵکی دیکەی رادەگەیێنێ .

هەر هونەرمەندێکی جسنیش ، شێوازێکی تایبەتی خۆی هەیەو لە هونەرمەندانی دیکەی جودا دەکاتەوە . بۆیێکە . ئەوانەی خەریکی لاسایی کردنەوەی هونەرمەندانیتر دەبن . کەسایەتی دەدۆڕێنن‌و بە هونەرمەندی جسن (= أصیل) ناژمرێن . (خانی)ش ، لە هۆناندنەوەی داستانەکەیدا ، شێوازێکی ئەوتۆی بەکارهێناوە ، کە شارەزایانی (مەم‌و زین) ، لە هەموو بەندەکانیدا هەستی پێ دەکەن‌و دەیناسنەوە .

شاعیر ، لە بەندی هەشتەمی کتێبەکەیدا ، دەست بە گێرانەوەی چیرۆکەکە دەکاو ئەوە دەردەبڕێ کە لە زاری یەکێکی دیکەوە دەیگێڕێتەوە .

**نەقاشی سەحیفەیی حکایەت**
**نەقادی سەبیکەیی روایەت**

*

**کێشا ب‌ڤی تەرحێ رەسم‌و ئایین**
**لێدا ب‌ڤی تەرزێ زەرب‌و تەزیین**

*

**گۆ : پادشەهەك زەمانی سابق**
**رابوو دحکوومەتا خوە ، فائق**

*

ئەم شێوازەش ، شێوازی حکایەتخوانی (Story Telling) یاخود (Narration)ەو ، هیچ جیاوازی نەدەبوو - لەم بارەوە - گەر یەکسەر ، بە زمانی خۆیەوە ، سەربردەو رووداوەکانی بگێڕابایەوە .

بەڵام خانی ، هەروا بە سادەیی ، داستانەکەی رانەگەیاندوە ، بەڵکو ، تەکنیکێکی ئەوتۆی بەکار هێناوە . تەووژم‌و تینێکی تەواوی بەگیانی کەسەکانی چیرۆکەکە بەخشیوەو لە سەر شانۆی ژیانی رۆژانەدا ، بە زمانی هێناون‌و خستوونیەتە بزووتنەوەو گفت‌و گۆکردن .

کەواتە (خانی) ، سەرڕای شێوازی حکایەتخوانی . تەکنیکی دراماییی گفت‌وگۆکردن (= الحوار dialogue)و تەکنیکی مۆنۆلۆگ (monologue)یشی خستۆتەکار . واتا کەسەکان ، لە هەلویستی تایبەتدا ، لە بەرخۆیانەوە قسە دەکەن .

جگە لەمانەش ، لە هەندێ شوێنان - بێ‌ئەوەی کار لە زنجیرەی رووداوەکان بکا - جلەو بۆ نووکی خامەی شل دەکات‌و ، یان بە ناسکترین پارچە شیعری ویژدانی بڕ لە هەواڵی دەروونی‌ی خۆی دەکا ، یان لە شێوەی مەسەلەو قیاسی مەنتق ، باوەڕی ئەخلاقی‌و فەلسەفی‌شی دەکاتەوە .

ئەمجا بۆ ئەوەی لایەنی دراماییی داستانەکە بخەینە بەرچاو ئەم چەند بڕگەیە ، لە بەندی (٤٢)یدا . دەکەین بە نموونەی دایالۆگی کەسەکان ، کە سەدای گفت‌و گۆی سەرشانۆ دەداتەوە :

دوای ئەوەی (میر) یاری شەترەنج لە (مەم) دەباتەوە . بەم چەشنە ، گفت‌و گۆیان دەبێ :

**میر گۆتە مەمی : «مە برخۆ دلخواز !»**
**وی گۆ کو : «بێ . چیە تە داخواز ! ؟»**
**«میرگۆ : » مە . غەرەز نەکەسی ماله»**
**«مەقسوود ژی طی کەشفی حاله»[٧]**
«مەتلووب ژ لەعب‌و بەندو بازان .»
«قەت نینە ب غەیری کەشفی رازان»

«شەرتی من ئەوە بکەی تو ئیقرار»
کانی د دنیێ کییە تە دلدار ! ؟»
«هەرچی پەری‌یا تەدل ل بالە»
«حۆری سفەتە ، مەلەك میسالە»
«گەر لائقی تە ئەوی ببینم»
مالی خوە بدەم ژبۆ تە بینم»
(بەکر بۆ ئەوەی (مەم) بووروژێنی‌و رازی دڵدارییەکەی پێ ئاشکرابکا ، بەم چەشنە دێتە قسە :
**گۆ : «من دییە یا مەمێ حەباندی»**
**کیژەك . . . . . . . لێڤ دەڤاندی»**

*

**«سەر تا ب پیان رەشە وەکی قیر»**
**نە لائقی بەحس‌وخواستنا میر»**
قسەو تانووتەکەی (بەکر) نیشان دەپێکی‌و پەردە لەسەر رووی رازی پەنهانی دڵی دڵدارەکە هەڵدەماڵێ :
**گۆ : «قەت نەوەیە وەکی وی گوهتی»**
**«میرم پەری‌یا دلی‌من سۆهتی»**
**«شەهزادەیە ، شەهنشین مەکانە»**
**«عونقایە بلندی ئاشیانە»**
**«میرانی‌یە ئەو ، ژ نەسلی پاکە»**
**«نوورانی‌یە ئەو نە ئاب‌و خاکە»**
**«سەر دەفتەری حوورو نازەنینە»**
**«هەرچەند مەلەك ، ب ناڤی زینە .»**
ئەم وەڵامە رەق‌و ناشیرینە ، ئەوها میر دێنێتە دەنگ :
**وی گۆ تە قەبیلەیا غولامان :—**
**«هوون بۆ چی گەلی نمەك حەرامان»**
**«وی ناکەسی ناگرن ب زیللەت ! »**
**«دا ئەز بکوژم ئەوی ب عیبرەت ! ؟»**
کە دەست‌و پێوەندەکانی (میر) ، دەیانەوی پەلاماری (مەم) بدەن ، تاجدین‌و برایەکانی لەسەر مەم دەکەنەوەو بەم چەشنە بەرامبەریان دەوەستن :
**گۆتن : «گەلی جوندییان ڤەوەستن»**
**«هوون جوملە نە سەرخوەش‌و نە مەستن»**
**«هوون قەنجی دزانن ئەم گوسانن»**
**«ساحیب هونەرن ئوو پەهلەوانن»**
**«پانسەد ژوە حەملەکەن ب کەربان»**
**«نادەینەوە نەوبەتا چو زەربان»**
**«حەتاکو بکەن مەمێ گرفتار»**
**«سێ سەد ژ وە دێ بین بریندار»**
**«حەتا نە مەهەر سێیان ب کەرکەن»**
**«هووندێ ل مەمێ کوسا نەزەرکەن ؟ ! »**
**«هەرچی کری حاکمێ مە فەرمان»**
**«ئەم نابنە مانعی چو حوکمان»**
**«دەستێدمە بەستنە ل بەرمیر»**
**«ها ، گەردەن‌و پێ ئودەست‌و زنجیر»**
هەر وەها ، کەسەکانی چیرۆك ، لە زۆر هەڵوێستاندا . لەبەرخۆیانەوە ، بە دەنگی بەرز ، پڕ لە هەواڵی دەروونی‌ی خۆیان دەکەن . هەتا ، کۆتایی داستانەکەش ، بە شێوەنە بە ناو بانگەکەی (زین)ێ ، هاتوە . ئەمەش وێنەیێکی تەکنیکی مۆنۆلۆگە ، کە (زین) ، لەبەرخۆیەوە دوای زیندانکردنی (مەم) ، دڵ‌و گیانی خۆی دەدوێنێ :
**«ئەی دل تو ژ قەلبێ من ب دەرکەڤ»**
**«وەی جان ، تو ژی بۆ دلێ ب بەرکەڤ»**

*

**«هوون هەردوو هەرن مەمێ ببینن»**
**«لێ یەك خەبەرێ ژ بۆ مە بینن»**

*

**«ئەی دل تو ، کو لێ دکەی سەلامی»**
**«زوو بینەڤە بۆ مەرا پەیامی»**

*

«کانی ب چه حاله ئەو گرفتار ! ؟»
«دانین چه خەیاله ئەو دل ئەڤگار ! ؟»

*

«کانی ، ل مه ئاشه ! یانه زیزه ! ؟»
«باخی وی بەهاره یا پەییزه ! ؟»

*

«خۆش ڕەنگ‌و لەتیفه شوبهی سۆرگول ! ؟»
«یان ژارو زەعیفه میسلی بلبل ! ؟»
«ئەیوان لـمه بوویه داری میحنەت»
«زیندان بـمه . بوویه باغی جەننەت»

*

«خۆزیا کو لـمن غەزەب کرا میر»
«مانەندی مەمێ ب غیلل‌و زنجیر»

*

«ئەز ژی بشەهاندما وی چالێ»
«رۆژەك ڤەکەتا ل من ژ سالێ»
«جارەك بدیبا من ئەو گرفتار»
«دەرمان ب کرا من ئەو بریندار»

*

عومری من ئەگەر چی یەك رەمەق‌بوو»
«حەقەن کو مرن ژ بۆمه حەق‌بوو . »

### ٣ - کێشی شیعریی مەمو زین .

شیعر ، هونەرێکی ئەوتۆیە کە بە دەنگ بخوێندرێتەوە . داستانە کۆنەکانی وەك (ئەلیادو ئۆدێسە)ی (هۆمەر) لە گەڵ ئاوازەی گیتار دەگوتران . (شهنامە)ی (فردوسی)ش بۆ ماوەی سەدان ساڵان ، سەرمایەی حکایەتخوانان بوە .

گەرچی ئێستا ، بەلای زۆری ، شیعر بە چاو دەخوێندرێتەوە . هەتاوەکو بە دەنگ ، بەلاّم هێشتا خاسییەتە کۆنەکەی پاراستوەو سوودێکی زۆر ، لە ئاوازەی دەنگەوە . دەبینێ .

ئەو خوێنەرەی کە بەچاوەکانی‌و بە بێ دەنگی شیعر دەخوێنێتەوە ، وهای لێ چاوەنوار دەکرێ . ئەوە بە بیری خۆیدا بهێنێ ، کە ، ئەگەر هات‌و شیعرەکەی بە دەنگی بەرز خوێندەوە ، چە ئاوازو ئیقاعی مۆزیقی‌ی لێ دەبیسترێ .

هەڵبەت ، مۆزیقاو ئیقاعی شیعری . لە کێشی شیعرەکەوە پەیدا دەبێ ، گەرچی قافیەش ، لە شیعری قافیەداردا . لەم لایەنەوە ، دەورێکی تایبەتی هەیە .

کەواتا ، مەبەست لە کێش (= وزن) چۆنیەتی‌ی دامەزراندن‌و ڕێکخستنی برگەی دەنگی ووشانە . لە دێرە شیعرێکدا ، بە شێوەیێکی ئەوتۆ . کە خوێندرایەوە . سەرڕای واتاکەی ، ئاوازەو ئیقاعێکی مۆزیقیشی هەبێ .

(ئەرستۆ)ی دانا . کێشی بە بنچینەی هونەری شیعر داناوە . شیعری (یۆنانی کۆن)یش . زۆر بابەتە کێشی هەبوەو سەرچاوەی کێشەکانی شیعری‌ی (Meterrical rhy Thym) . نەتەوەکانی رۆژئاولین . هەتا شیعری سەربەستی (Free Vetse) ئەم نەتەوانەش ، گەرچی پێرەوی کێشەکانی (میتریکاڵ) ناکەن ، دیسان جۆرە سروەو ئیقاعێکی تایبەتیان هەیە[9]

شیعری فۆلکلۆری کوردیش . دوو جۆرە کێشی نەتەوەیی هەیە :

یێکەم : کێشەکانی داستانین . واتا ئەو کێشانەن کە (بەیت‌و لاوك‌و حەیران) یان لەسەر ڕێکخراوە .

ئەگەرچی سەرجەمی برگەی دەنگی‌ی دێرە شیعرەکانی ئەم بابەتە ، ئەوەندەی یەکتر نابن ، بەلاّم هەر دێرە شیعرێك لەرەو ئیقاعێکی تایبەت‌و ئەوتۆی هەیە . کە لە گەڵ مۆزیقای برگەی دەنگەکانی دێرە شیعرەکەی دواوەی . دەسازێ . وادیارە لە شیعری نەتەوەکانی رۆژئاواشدا ، بابەتە کێشی ئەوتۆ هەیە . کە ناچێتەوە سەر هیچ یەکێك لە کێشەکانی (میتریك) . واتا کلاسیکیان . ئەم جۆرە کێشەش . بە تایبەت لە شیعری

نە سیحرەکانی بێ . منیان خۆش نەدەویست ، بەڵام بەخۆو بەو تفەنگە سیحراوی‌یەوە ئەوەی دەهێنا چاوم لێ نەتروکێنن . کەچی وێڕای ئەو هەموو بەزم‌و ڕەزمەش کت‌وپڕ هەستم بەوە کرد کە دەبێ تەقە لە فیلەکە بکەم‌و بیکوژم . خەڵکەکەش چاوەڕێی هەمان شتی دەکردو دەبووایە منیش نائومێدیان نەکەم . لەیەك‌ساتدا دوو هەزار ختوورەو ئارەزوو لە ناوەوە پاڵی پێوە دەنام بچمە پێشەوە . . بەرادەیەك نەمدەتوانی پاشگەز بمەوە . ئا لەم ساتەدا ، کە وەستا بووم‌و تفەنگەکە لەنێو دەستما بوو ، بۆ یەکەمجار لە ژیانما هەستم بە بۆشی‌و بەتاڵی‌و بێ‌خێری‌و هیچی دەستەلاتدارییەتی پیاوی سپی‌پێست کرد لە ڕۆژهەلاتدا . ئەوەتا لەوێ وەستابووم ، من . . پیاوێکی سپی‌پێست‌و تفەنگەکەی ، لەبەردەم خەڵکێکی زۆری شارەکە کە هەمووی بێ‌چەك‌و دەست‌بەتاڵ وەستابوون — بەم شێوەیە لە پاڵەوانی سەرەکی شانۆگەرییەك دەچووم ، بەڵام لەڕاستیدا من تەنها یاری‌یەکی منالانە ، بووکەشووشەیەکی هیچ‌و عەنتیکە بووم‌و بەویستی ئەو هەزارەها دەم‌وچاوە زەردەی دوامەوە دەچوومە پێش‌و دەهاتمە دواوە . ئا لەم ساتەدا گەیشتمە ئەو قەناعەتەی بڵێم : کە پیاوی سپی‌پێست دەبێ بە زۆردارو خاوەن‌دەستەلات . . بەم شێوەیە سەربەستی خۆی لەناو دەباو دەیسڕێتەوە ، دەبێ بە بووکەسەماکەرەیەکی هیچ‌و بێ‌مانا ، بەخۆیەوە دەنازێ ، دەبێ بە وێنەیەکی تەڵخ‌و ناشیرینی گەورەکەی ئەو گەورەیەی وەك ئیمپریالیستێك خۆی سەپاندووە . چونکە یەکێ لە مەرجەکانی دەستەلاتدارییەتی ئەوەیە کە بە بەردەوامی بتوانێ کار لە دانیشتووانی شارو ولاتە داگیرکراوەکان بکا ، بۆیە دەبێ لە هەموو نەگبەتی‌و کارەساتێکا بەپێی بۆچوون‌و ڕوانینی ئەو هاوولاتیانە ڕەفتار بکاو نابێ نائومێدیان بکا ، دەبێ دێوجامە (ڕووپۆش) لەسەرنێ ، دەم‌وچاویشی پڕ بەو دێوجامەیە قاڵب دەگرێ . دەبووایە ئەو فیلە بکوژم . هەر لەو ساتەوەی کە ناردم تفەنگەکەم بۆ بێ . . ئەم بڕیارەمدا . چونکە سپی‌پێستی دەستەلاتدار — ساحێب — دەبێ وەك دەستەلاتدارێك ڕەفتار بکا ، دەبێ ڕاراو دوودڵ نەبێ . . بزانێ چی گەرەکەو لەسەر چی بڕیار دەدا منێك کە ئەو هەموو ڕێگە دوورەم بڕی بێ ، بە خۆم‌و بەتفەنگەوە ، دوو هەزار کەسیش بەدوامەوە ، بەو بێ‌هێزی‌یەوە قاچەکانم بەدوای خۆمەوە ڕاکێشابێ ، کەچی ئێستاش هەروا بوەستم‌و جوڵە نەکەم — نەخێر ، ئەوەیان هەرگیز ناشێ . ئاخر ئەوسا ئەو هەموو خەڵکە پێم پێ‌دەکەنن ، هەموو ژیانی منیش . . بگرە هەموو ژیانی پیاوی سپی‌پێست لە ڕۆژهەلاتدا : هەوڵ‌و کێشەیەکی بەردەوام بووە تا نەبێتە مایەی مەزاق‌و پێکەنین‌و گاڵتەپی‌کردن .

من نەمدەویست تەقە لە فیلەکە بکەم ، لێی ورد بوومەوە . . قامکە گیای بە ئەژنۆی‌دا دەکوتا ، تەنها ئاگای لە دونیای خۆی بوو ، چووبووە ژێری‌و سەرقاڵی‌ی پێوە دیار بوو ، سەرقاڵی‌ی فیلەکانیش لە هی پیرەژنەکان دەچێ . هەستم کرد کوشتنی ئەو فیلە تاوانێکی گەورەیە . . ئەگەرچی لەو تەمەنەدا هەستم نەدەکرد کوشتنی ئاژەڵێك بێزەوەری بێ ، بەڵام قەتیش تەقەم لە فیل نەکردبوو . . نەشمدەویست تەقەی لێ‌بکەم . . هەرگیز (بەهەرحاڵ . . هەمیشە کوشتنی گیانلەبەرێکی وا زەبەللاح‌و گەورە شتێکی خراپەو بگرە نەنگی‌یە .) وێڕای ئەوەش . . خۆ دەبێ ئەوەش لەبەرچاو بگیرێ کە فیل خاوەنی خۆی هەیە . خۆ نرخی فیلی زیندووش لە سەد پاوەند کەمتر نی‌یە ، بەڵام کە مرد . . تەنها نرخی کەڵبەکانی خۆی دەکا . . واتا نزیکەی پێنج پاوەند . . دەبوو بەپەلە بەخۆ کەوم‌و دەست‌وەکەری بکەم . ئاورێکم لە هەندێکیان دایەوە . . لەو —بورما—یی‌یانەی پێشی من گەیشتبوونە ئەو شوێنە . . لەوە دەچوو شارەزاو پسپۆر بن ، لێم‌پرسین ئاخۆ فیلەکە تا ئەو حەڵە چی دەکرد . هەموویان هەمان قسەیان دووبارە کردەوە : ئەگەر نەیوروژێنیت هەقی بەسەرتەوە نی‌یە ، بەڵام لەوانەیە پەلامارت بدا گەر زۆر لێی نزیك بیتەوە .

زۆر بەجوانی لام ئاشکرابوو کە دەبێ چی بکەم . دەبوو بچمە پێشەوەو لە فیلەکە نزیك ببمەوە ، تۆ بڵێ : بیست‌و پێنج

یاردەیەك . . تا بزانم چۆن ڕەفتار دەكاو چی بەسەر دێ .
ئەگەر هێرشی بۆ هێنام . . دەیكوژم ، خۆ ئەگەریش جولەی
نەكردو گوێی پێ نەدام . . ئەوە وا سەلامەترە منیش وازی
لێ بێنم تا خاوەنەكەی دێ و دەیباتەوە . بەلام دلنیاش بووم
لەوەی كە ئەوەندە عاقل نیم . خۆم ئەوەندە شارەزای تفەنگ و
نیشانەشكاندن نەبووم ، زەوی یەكەش قوڕولیتاوێكی نەرمۆك
بوو . .بەرادەیەك لەگەل هەر هەنگاوێكدا مرۆڤ تیایدا نقوم

دەبوو خۆ ئەگەر بەیەكەم گوللە نەمپێكاو بەتاو هێرشی بۆ
هێنام . . هەلبەتە ئەوساش هەر بەقەد بۆقێكی ژێر پێچكەی -
ڕۆلە - یەك هەلوبواری ڕزگاربوونم دەبێ . هەتا لەو
ساتەشدا ، بەشێوەیەكی تایبەتی ، بیرم لە ڕزگاربوونی ڕۆحی
خۆم نەدەكردەوە ، بەلكو بیروخەیالم لای ئەو حەشاماتە بوو .
ئەو ڕەنگ زەردانەی تێكرا سەرنجیان دەدام و لێم ورد
دەبوونەوە ، چونكە لەوساتەداو بەبونی ئەو هەموو خەلكەی
سەیریان دەكردم : وا بەئاسانی نەدەترسام . . وەك ئەوەی گەر
هەر خۆم بەتەنیا بوومایە . پیاوی سپی پێستیش نابێ لەبەرچاوی
خەلكانی شارو ولاتی دیكەدا بترسێ ، ئا بەم شێوەیەو بگرە
بەگشتی كابرایەكی نەترسە . تاكە بیرۆكەیەك لە مێشكمدا
ئەوەبوو : گەر بێت و نەتوانم فیلەكە بپێكم . . ئەوسا ئەو دوو
هەزار كەسە ڕاوەدووم دەنێن و دەمگرن و لەبەرپێیان دەكەوم و
دەمپلیشێننەوە . . پاشان وەك كابرای هیندی سەر گردەكە دەبم
بە لاشەیەكی ددان گرو بەریچداچوو ، خۆ ئەگەریش شتی وا
ڕوویدا . . لەوانەیە هەندێكیان قاقا پێ بكەنن . . كە شتی وا
هەرگیز ناشێ و نەبووە . . تەنها یەك ڕێگەی دیكەم لەبەر دەمدا
بوو . تفەنگەكەم پڕ كرد لە گوللەو لەسەر ڕێگاكە ڕاكشام تا
چاكتر خۆم بحێوێنمە نیشانەكەو جوان بیپێكم .

سەرتاپای ئەو حەشاماتە كپ و بێ دەنگ بوون . . تەنها
گوێم لە چرپەو هەناسەی شادومانی قوول و نەرم و لەسەرخۆی
ئەو خەلكە بوو . . ئەو دەنگە نزمانە لە هەزارەها قورگەوە
دەردەهاتن . . دەتوت دەنگی ئەو خەلكەیە كە لە كاتی لادانی
پەردەی سەر شانۆیەك دێتە بەرگوێت . وێڕای ئەو هەموو
هەرایەش . . ئەو خەلك و خوایە بەزم و گالتەو ڕابواردنەكەی بۆ
ڕەخسابوو . تفەنگەكە : تفەنگێكی ئەلەمانی نازدار بوو . .
دەرزیلەی نیشانە - پێكانی نەیدەهێشت گوللەی بەخەسار
بچێ . نەمدەزانی لە كاتی تەقەكردن لە فیلێك دەبێ هێلێكی
خەیالی بكەی بە نیشانە ، هێلێك لەم كونە گوێچكەیەوە بڕواو
لەوی دیكەیان بچێتە دەر . . كەواتە بەم شێوەیە كە فیلەكە
تەنیشتی لە من كردبوو . . دەبووایە ڕاستەوخۆ كونی گوێی
ئاگردەم ، لەڕاستیدا . . نیشانەم گرتە ئەو شوێنەی چەند
گرێیەك - ئینجێك - دەكەوێتە بەرگوێی . . چونكە وام
هەست دەكرد مێشك تۆزێ لە پێشەوەتر بێ .

كە پەنجەم لەسەر پەلاپیتكەكە داگرت : نە گوێم لە زرمەی
تەقینەوەكە بوو ، نە هەلگەڕانەوەی تفەنگەكە - گەر گوللە
شوێنی خۆی بگرێت . . مرۆڤ هەست بەم شتانە ناكات --
بەلام گوێم لە هەراو زەنای شەیتانانەی حەشاماتەكە بوو . لەو
ساتەدا ، لەمیانەی چاوتروكانێكا ، كورتر لەو ماوەیەی گوللەیەك
نیشانە بپێكێ ، گۆڕانێكی سەیرو ترسناك بەسەر فیلەكەدا
هات ، نە جولایەوەو نە كەوتە خوارەوە . . كەچی هەموو
دەمارێك ، هەموو موویەك لە لەشیا گۆڕاو لەرزی . كت وپڕ
كورژ بۆوە ، لەناكاو هەستت بەوە دەكرد كە زۆر پیر بووبێ . .
هەروەك بلێی گیزەی ترسناكی گوللەكە ، بێ ئەوەی بیخاتە
سەر زەوی ، ئیفلیجی كردبێ . لەكۆتاییدا . . دەتوانم بلێم
قەیرێكی پێ چوو - تۆبلێ پێنج چركە - فیلی زەبەللاح
بەربۆووەو كەوتە سەر ئەژنۆكانی لیكاوێك لەدەمی یەوە ڕژا .
لەوە دەچوو زۆر ژیابێ و بەیەكجاری پەكی كەوتبێ و پیر بووبێ .
ئەگەر یەكێك سەیری بكردایە . . وای هەست دەكرد تەمەنی
هەزار سالە . دووبارە نیشانەم لە هەمان خال گرت و تفەنگەكەم
ئاگردا . . بە گوللەی دووەم لە پەل وپۆ نەكەوت . . بەلكو
بەبێ هێزی یەوە هەستایەوەو لەسەر هەر چوار پەل وەستا . .

قچەکانی دەلەرزین‌و سەریشی شۆڕ ببۆوە . سیٚیەم گوللەشم پێوەنا . ئەمەیان بەتەواوی لە پەل‌وپۆی خست . دەتتوانی هەست بەو ئازارە بکەی کە هەموو گیانی هێنابووە سەر ەرزین . . ئەو گوللەیە بەتەواوی هێزی لەبەر بڕی‌و چوار پەلی شکاند . بەلاّم لە کاتی کەوتنا ، بۆ ساتەوەختێ ، لەوە دەچوو هەوڵی ئەوە بدا ڕاست بێتەوە . . چونکە لەو کاتەی هەردوو قچی پشتەوەی لەژێریدا شکانەوە : دەتوت کەرتە شاخەو هەڵنداوەو بەگرانی دێتەخوارێ . . لموزیشی وەك درەختێك ڕووەو ئاسمان بەرز ببۆوە . . بۆ یەکەم‌جارو دواجار بۆڕاندی‌و کەوتە سەر زەوی ، کە کەوتە سەرتەنیشت سکی دەرکەوت . . لەگەڵ بەربوونەوەی زرمەی لێ هەڵساو کردی بوومەلەرزەیەك . . ئەو بوومەلەرزەیە ئەو شوێنەشی گرتەوە کە منی لێ ڕاکشا بووم .

هەستامەوە . (بورما)یی‌یەکان بەناو قوڕو لیتاوەکەدا پێشم‌کەوتن ، ئاشکرابوو کە فیلەکە جارێکی دیکە ڕاست بێتەوە ، بەلاّم هێشتا نەمرد بوو . بە ئیقاعەوە هەناسەی دەدا . . بەدەم هەناسەوە لرخە لرخی بوو ، دەتوت گردە . . بەئازرایێکەوە لاتەنیشتی بەرزو نزم دەبۆوە ، زاری کرابۆوە . . دەمتوانی ناو دەمی و بگرە گۆشەکانی قورگیشی ببینم کە سوور دەچۆوە . . سوورێکی کاڵ . زۆر چاوەڕێم کرد تا بمرێ . . کەچی هەروەك خۆی بەهەمان ئیقاعەوە هەناسەی دەداو هێواش نەببۆوە . بۆ دوا جار دوو گوللەی دیکەم پێوەنا . . نیشانەشم لەو شوێنە گرت کە بە خەیاڵی خۆم وای بۆ چووم دڵی بێ . . ئیتر گوللەم پێ نەما . خوێنێکی خەست وەك مەخمەری سوور چۆڕاوگەی بەست . . بەلاّم لەگەڵ ئەوەشدا نەمرد ، کە ئەو دوو گوللەشی بەرکەوت موویەك لە لەشی نەلەرزی . . بەئازارەوەو بێ وەستان هەناسەی دەدا . زۆر لەسەرخۆو بەژانێکی کوشندەوە وەنەوزی دەدا . . لە دونیایەکی دوورو سەربەخۆ ، دوور لە جیهانی من ، بەرادەیەك گوللەیەکی دیکەش نەیدەتوانی لەوە خەراپتری پێ بکا . وام هەست کرد

کە دەبێ کۆتایی بەم نرکەو ناڵینە ترسناکە بێنم . بەلامانەوە ترسناك بوو گیانلەبەرێکی وا گەورەو زەبەللاح ببینین لەوێ کەوتووە . . کە نە توانای هەیە بجوڵێ ، نە دەشتوانێ بمرێ . لە هەمان کاتیشدا نەتوانین کۆتایی بە ژیانی بێنین .

دووبارە یەکێکم نارد تا تفەنگە قوتەکەم بۆ بێنێ ، دڵی‌و قورگیم گوللەباران کرد ، هیچ کاری لێ نەکرد . . هەر وەك بڵێی نە بای دیوەو نە باران . بەهەمان ئازارو ئیقاعی جارانەوە هەناسەی دەدا . . ئیقاعێك وەك چرکەچرکی سەعات .

لەکۆتاییدا نەمتوانی چیتر بوەستم‌و گەڕامەوە پاشان بیستمەوە نیو سەعاتی خایاندووە تا مردووە . بەرلەوەی ئەوێ بەجێ بێڵم – بورما –یی‌یەکان بەخۆو بە زەمبیلەو چەقۆی دەستیانەوە دەورەیان لە فیلەکەدا . . پاشان پێیان وتم کە تا پاش نیوەڕۆی ئەو ڕۆژە ئیزرەمە گۆشتێکیان پێوە نەهێشت‌و تا سەر ئێسقان ڕووتیان کردەوە .

هەڵبەتە پاش ئەو هەرایە ، سەبارەت بە کوشتنی فیلەکە ، بوو بە مشت‌و مڕو دەمەتەقێیەکی بێ‌کۆتایی . خاوەنەکەی ئەوەندە پەست‌و تووڕە ببوو ئاگری دەکردەوە ، بەلاّم وەك هیندی‌یەك نەیدەتوانی هیچم لێ بکا . وێرای ئەوەش . . بەپێی یاسا من بێ گوناە بووم‌و هەقی ئەوەشم هەبوو فیلەکە بکوژم ، چونکە فیلی هارو بەلەسە وەك سەگی هار کوشتنی حەلاّڵەو دەبێ بشکوژرێ . . بەتایبەتی گەر خاوەنەکەی نەتوانێ بەرزەفتی بکا . ئەوروپی‌یەکانیش سەبارەت بەم مەسەلەیە بیرو بۆچوونی جیاجیایان هەبوو . پیرەکان لەو باوەڕەدا بوون کە من لەسەر هەقم ، گەنجەکانیش دەیان وت : ئەوپەڕی شورەیی‌یە لەسەر کوشتنی حەماڵێکی هیندی (Coolie) فیلێك گوللەباران بکرێ‌و بکوژرێ . . چونکە ، لای ئەوان ، فیلێك گەلێ چاکترو بەنرخترە لە حەماڵێك . پاشانیش من دڵم بەوە خۆش بوو کە فیلەکە کابرای هیندی کوشتبوو . . چونکە تەنها لەم ڕوانگەیەوە هەستم دەکرد بێ گوناهم‌و . . لەسەر هەقیشم . . . ئەمەشیان بووەبیانوویەکی دروست‌و بەجێ بۆ ئەوەی دەست

نەپارێزمو تەقە لە فیلەکە بکەم . بەڵام زۆرجاریش لەگەڵ خۆمدا لێکم دەدایەوەو دەمپرسی :

تۆبڵێ یەکێك لەوان هەستی بەوە کردبێ کە من تەنها لەبەر ئەوە فیلەکەم کوشت تا لەبەر چاوی ئەو خەڵکە گێلو نەفام دەرنەچمو نەبمە مایەی پێکەنینو لاقرتێ .

١٩٣٦

**پەراوێز :-**

(١) «کوشتنی فیلێك» یەکێکە لەو نووسینە نازدارانەی - جۆرج ئۆروێل -ی ڕۆماننووس . بەڵام لە هەندێ کتێبدا وەك چیرۆك حیسابی بۆ کراوەو لە هەندێ کتێبی دیکەشدا وەك یاداشتێکی ڕاستەقینەی ژیانی - ئۆروێل - تۆمارکراوە . لە هەردوو حاڵەتدا . . ئەم نووسینە نرخو بایەخی گەورەی لەوەدایە کە -ئۆروێل- بەتەواوی چاوی لەو ڕاستی‌یە بکاتەوە کە ئیمپریالیزم تەنها وشەیەك نی‌یە . بەڵکو ئەهریمەنێکی ڕەشەو بێ ئەوەی ئاگات لە خۆت بێ دەتخاتە پاڵ بەرەی چەوسێنەران . هەڵبەتە نووسەر لەتاو هەژاریو وەرنەگیرانی لە دانیشگا هەمان ڕێڕەوی باوکی هەڵبژاردو پەیوەندی بە هێزی پۆلیسی ئینگلیزییەوە کردو لە وڵاتی - بورما بوو بە ئەفسەری سەرپەرشتیاری کاروباری ئیمپراتۆرییەتی - بریتانیا-و لەوێ بەچاوی خۆی زۆر ستەمو زۆرداری‌ی دی . . بۆیە نەیتوانی بەردەوام بێو ڕق لە ئیمپریالیزم هەڵگرتو لە ساڵی (١٩٢٨)دا وازی لەم پیشەیە هێنا . هەر ئەوەشیان بوو بە هەوێنی یەکەم ڕۆمانی کە لەژێر ناوی - ڕۆژانی بورما -دا بڵاوبۆوە . .

ئەوەتا هەر خۆی لە وتاری- بۆ دەنووسم[٥] - دا دەڵێ - «یەکەمجار بۆ ماوەی پێنج ساڵ لە -بورما-دا خەریکی کارێکی زۆر نابەجێ بووم کە سەر بە ڕاپەڕاندنی کاروباری (پۆلیسی ئیمپراتۆرییەتی هیند)ی بوو . . هەر ئەوسا زۆرم تاڵاوی کەساسیو هەژاری تۆشی هەستم بە نوشوستیو هەرەسو ڕووخانو کەوتن کرد . ئەوەیان وای لێ‌کردم چاکتر شارەزای سروشتی ئیمپریالیزم بم .» هەموو جارێکیش ئەمەی دووپات دەکردەوە : «بۆ ئەوەی قینت لە ئیمپریالیزم بێتەوە : دەبێ بەشێك بیت لەو سیستەمەی کە ڕایگرتووە .»

لە کۆتاییدا با ئەوەمان لەبیر نەچێ کە (کوشتنی فیلێك) ڕاپۆرتێکی ئاسایی نی‌یە . پێش هەموو شتێ کارێکی ئەدەبی ئاسکەو - ئۆروێل - لەژیانی ڕاستەقینەو پڕ ئەشکەنجەی خۆی دەدوێ . . هەر ئەم ڕووداوە سەیرو ساکارە وای لە (ئۆروێل) کرد هەست بکا بۆتە مرۆڤێکی ئامێرئاسا ، بۆتە مەقاشی دەستی ئیمپریالیزم . . ئەوە بوو بۆ دواجار لەو سیستەمە گەندەڵە هەڵگەڕایەوەو تاجو ئەستێرەکانی سەر شانو بەخەی خۆی داماڵی . !

(٢) - مۆلماین :- شارێکە کەوتۆتە خوارووی - بورما -و سەر دەریای - ئاندمان

(٣) - بورما - وڵاتێکە کەوتۆتە خوارووی (چین) ، سنووریشی : لەڕۆژهەڵاتەوە وڵاتی (سیام)ەو لە ڕۆژئاواوە (ئاسام)و (بەنگلادش)ە .

(٤) - بیتڵ - گەڵای جۆرە ڕووەکێکە خەڵکانی (بورما) وەك بنێشت دەیجوون .

(٥) - بۆ ژیانی - جۆرج ئۆروێل - یش بڕوانە گۆڤاری (کاروان) ژمارە (٣٤) کە لەگەڵ نووسینێکی ئەم نووسەرە لەژێر ناوی -بۆ دەنووسم -دا بڵاوم کردۆتەوە .

لە کتێبی
A Collection of Essays by Geory Orwell
Auther of Nineteen Eighty – Four Harbrace Paperbound Library Inc. New – York. Copyright (1946)
لاپەڕە 148 - 156

## Mademoiselle Fifi

### باکوری

### لە ئینگلیزی‌یەوە وەریگێڕاوە

هێشتا مێجەر کۆنت ڤۆن فارلسبرگ ، فەرماندەی پرووسی لە خوێندنەوەی نامەکانی نەبووبووەوە لەکاتێکا کە لەنێو پاڵپشتەکەی‌دا ڕاکشابوو ، هەردوو قاچەکانیشی بەجزمە سەرباری‌یە قورسەکانی‌یەوە لەسەر ڕوخی ئاگردانە مەرمەری‌یەکە دادانابوونو ، بەرکێفە تیژەکانی دوو چاڵی گەورەی تی‌کردبووو ، ڕۆژبەڕۆژ گەورەتریش دەبوون . لەماوەی ئەو سێ مانگەی کەوا خۆیو کۆمەڵە سەربازەکانی هاتنە شارۆچکەی «یوڤیل»ی فەرەنسایی‌و داگیریان کردو لەکۆشکی فەرمان ڕەوایی‌یەکەی شار لێیان خستو نیشتەجێ بوون .

لەو لایشەوە فنجانێ قاوە لەسەر مێزێکی بەنرخو بەها دانرابووو ، هەڵمی لێ هەڵدەستا ، مێزەکە سەرتاپا لەکەی ژەنگاوی‌و پیسی پیوەبوو ، چونکە خواردنو خواردنەوەو تورشی و ڕۆنێکی زۆری بەسەردا ڕژابوو ، گەلێ جێگەشی بەئاگری جگەرە سووتێنرابوونو ، بە قەڵەم تراشیش لێرەو لەوێ ڕەسمو پیتو هێڵی جۆراوجۆر لەلایەن ئەفسەرە سەرکەوتووەکەوە هەڵکەندرابوون !

کە فەرماندەکە لە خوێندنی نامەکان بووەوە چاوێکی بە ڕۆژنامە ئەڵمانیەکان‌دا گێڕاو چەند لقە دارێکی تەڕی خستە نێو ئاگردانەکە ، ئەو دارانەی کە لە درەختەکانی باخچەی دەوروبەری کۆشکەکە برابوونو شکێنرابوون ، لەوکاتەوە کا گەیشتبوونە ئەوێ ، لەپڕ هەستایە سەرپێ‌و بەرەو پەنجەرەکا ڕۆیشت ، لە دەرەوەیش باران بەگوڕ دەهاتە خوارەوە ، ئە جۆرە بارانەیش جگە لە دەورو بەری زێ‌ی «ڕۆن» نەبێ ،

# مادموازێل فیفی

نابینرێ .

ئەفسەرەکە بۆ ماوەیەکی درێژ لەپێش پەنجەرەکەوە وەستاو چاوی بڕیبوە ئەو گۆرەپانەی کە لە بەردەم کۆشكو سەراکەوەبوو ، هەروەها ئەو دەشتو چیمەنە پانەی دوای گۆرەپانەکە ، بە پەنجەکانیشی هێدی هێدی لەسەر جامی پەنجەرەکە ئاوازێکی ڤالسیی لێ دەداکە لە هەریمی «راین»دا باوبوو ، لەناکاو لەپشتیەوە دەنگی ئەفسەرە یاریدەدەرەکەی ، بارۆن ڤۆن کێلونیشتاین ، رایچڵەکاندو هۆشی وەبەر هێنایەوە . . بارۆن ئێستاکە کاپتنە !

مێجەر پیاوێکی کەلەگەتو چوارشانە بوو ، ریشێکی درێژی هەبوو هەر لە پەری پانکەی دەکرد ، بەجۆرێ بەسەر سینگیدا بلاوبووەوە وەك ملوانکەی منالێ خۆی دەنواند ، بەشێوە هەر لە تاووس دەچوو ، بەلام کلکی لەژێر چەناگەیەوە بوو ! خاوەن دوو چاوی شینبوو ، لایەکی رووومەتی لەشەری نەمسا زامدار بووبوو ، وەك دەگێرنەوە ئەفسەرێکی ئازاو بلیمەتبوو ، هەرچی کاپتنەکەبوو کابرایەکی کورتیلەی دەمو چاو سوورکەلەی وورگن بوو ، قژە کورتە گرنجگرنجەکەی بەپێستی سەرییەوە نووسابوو ، لەبەر رووناکایی گڵۆبەکان دەتگوت بەفسفۆر سواغ کراوە ، دوو ددانی پێشەوەی کەوتبوون بۆیە بەچاکی قسەی بۆ نەدەکراو ، خەڵك بەدەگمەن لێی حاڵی دەبوون .

قوماندانەکە تۆقەی لەگەڵ داکردو ئینجا دەستی بۆ قاوەکەی برد ، کە شەشەمین فنجان بوو لە بەیانییەوە بۆی هاتبوو ، ئەوەی تیایدا مابووەوە خواردییەوە ، لە هەمان کاتیشدا گوێی بۆ کاپتن شلکردبووکە راپۆرتەکەی بۆ دەخوێندەوە دەربارەی جمو جۆڵو چالاکییەکانی بنکەکەیان ، لە پاشا لەگەڵ کاپتندا بەجووتەو بەپیاسەکردنێکی لەسەرەخۆ لەسەر ئەوە رێككەوتن کە کاروباری خۆیان وەی ناوچەکەش خاوبۆتەوەو هیچ جوڵانەوەیەك نییە . ئەمەش چونکە فەرماندەکە دوای ئەوەی ژنی هێنابوو ، ئیتر وازی لە هەموو شتێك هێنابوو ، کابرایەکی هێمنو لەسەرەخۆبوو ، تێکەڵی هیچ نەدەبوو ، کەچی کاپتنەکە پیاوێکی زۆڵو ، بێرێوجێو ، خاوەن ئارەزووی ناپەسندو ، خووو رەوشتێکی بەدفەربوو ، زۆریش توورەو توندو بێئارامبوو ، چونکە سێ مانگە وەك بەندکراو لێرە کەوتووە . . لەم شوێنە چۆلە وەستاوو مەندەدا .

کاتی ژەمی خواردنی نیوەڕۆ هاتو لەگەڵ سێ ئەفسەریتری گەنجدا لە ژووری خواردندا کۆبوونەوە ، مولازمییەکەم ، ئۆتۆ ڤۆن گروسلینگو ، مولازمی دووەم ، فریتز شێونا نبورگو مارکیز ویلهێلم ڤۆن ئیریك ، کە ئەمەیان پیاوێکی زیدە کورتیلە بوو ، قژێکی جوانی هەبوو ، بەلام یەکجار بەتوندی لەگەڵ دانیشتوانی شارە داگیرکراوەکەدا دەجووڵایەوە وتیژ تێی دەخورین و ، وەك گوللە تۆپ بەگژیاندا دەچوو !

هەر لەو کاتەی کە گەیشتوونەتە فەرەنسا ، هاورێکانی هەر بەناوی «مادموازێل فیفی» بانگی دەکەن ، چونکە خاوەن قەدێکی ناسكو باریك بوو ، هەروەها دەمو چاویشی هەمیشە زەردبوو ، لە رەوشتو گفتوگۆ کردنیشیدا بەناز بوو .

ژووری سفره له سه‌راكه‌ی شارۆچكه‌ی «یوڤیل»دا درێژو نرخداربوو ، ئه‌ویش به‌هۆی ئه‌و هه‌موو شته به‌نرخه‌ی تیایدا بوو ، به‌لام هه‌رچی ئاوێنه‌ی سه‌ر دیواره‌كان هه‌بوون ، هه‌مووی به گولله‌ی ئه‌فسه‌ره‌كان شكێنرابوون ، هه‌موو په‌رده گران به‌هاو چه‌رچه‌فو چارشێوو قه‌نه‌فه‌كان به‌شیر دراندرابوون‌و كه‌وتبوونه سه‌ر زه‌وی ، وه‌كو جل‌و به‌رگی شه‌مووله پارچه پارچه بووبوون !

ئه‌و جۆره كاره نارِه‌وایانه ئه‌وه‌ی ده‌گه‌یاند كه جه‌نابی مادموازێل فیفی به‌چی خۆی خه‌ریك ده‌كردو ، چۆن كاتی بێ‌ئیشی به‌سه‌ر ده‌برد !

له‌سه‌ر دیواره‌كان‌دا سێ تابلۆی جوان‌و به‌نرخ هه‌ل‌واسرابوون ، كه بریتی بوون له وێنه‌ی سوارێكی نێو زرێ‌یه‌كی ئاسنین‌و ، كاردینالیك‌و ، قازی‌یه‌ك . ئه‌مانه هه‌رسێكیان قه‌لوونی درێژیان ده‌كێشا ! ! له‌ولاشه‌وه وێنه‌ی ئافره‌تێك هه‌بوو به‌كراسێكی جوان‌و درێژه‌وه وه‌ستابوو ، سه‌ر به‌رزانه ته‌ماشای ده‌كرد ، به‌لام ، داخه‌كه‌م به خه‌لووز سمێلێكی گه‌وره‌ی بۆ دروست كرابوو ! !

ئه‌فسه‌ره‌كان هه‌موو به‌خامۆشی‌و بێ‌ده‌نگی له‌و ژووره گرژو مۆنه‌دا ژه‌مه‌كه‌یان خوارد ، له‌ژێر هاژه‌ی باران‌و له نێو ئه‌و خه‌م‌و خه‌فه‌ته‌ی كه له بێ‌ده‌سه‌لاتی‌و ژێر ده‌ستی‌دا پێوه‌ی دیاربوو . له‌سه‌ر ئه‌و ئه‌رزه ره‌ق‌و ته‌ق‌و ساردو سره‌ی ژووره‌كه كه له‌دار به‌روو دروست كرابوو ! هه‌ركه له‌نان‌خواردن بوونه‌وه ، ده‌ستیان كرد به‌جگه‌ره كێشان وباس كردنی ته‌نگ و چه‌لمه‌ی خۆیان ، له كاتێكدا كه شووشه‌ی براندی‌و خواردنه‌وه‌ی تریش له ده‌ستێكه‌وه بۆ ده‌ستێكی‌تر له نێوانیاندا ده‌هات‌و ده‌چوو ! هه‌ریه‌كه‌ش پێكه بن درێژه‌كانیان له‌نێو په‌نجه‌كانیاندا گرتبووو ، ده‌م نادەم له لێوی خۆیانیان نزیك ده‌كرده‌وه‌و مژێكیان لێ‌ده‌دا ، له‌به‌ر بێ‌ئارامی خۆیان هه‌ركه په‌رداخه‌كانیان به‌تال ده‌بوون ، بۆیان پر ده‌كرایه‌وه ! ته‌نها مادموازێل فیفی نه‌بێ ، كه ئه‌و بێ یه‌ك‌و دوو هه‌ر په‌رداخێكی بخواردبایه‌وه‌و به‌تال بوایه ، به هه‌موو توانایه‌وه له‌یه‌كێ له دیواره‌كانی رادەمالی‌و ووردو خاشی‌ده‌كرد ، ئینجا خێرا یه‌كێك له‌و سه‌ربازانه‌ی كه‌وا بۆ خزمه‌تیان دانرابوون ، به‌گورجی په‌رداخێكی تازه‌ی بۆ پرده‌كرده‌وه ، وای لێهات ژووره‌كه پر بووبوو له پارچه شووشه‌و دووكه‌ل ، پیاوه‌كان خه‌والوو بوون‌و خه‌و چاویانی كزكردبوو !

به‌لام بارۆن له ناكاو له‌جێ‌ی خۆی راست‌بووه‌وه‌و به ده‌نگێكی به‌رزه‌وه هاواری كردو گوتی :

– «به‌خوا ئه‌م حاله نابێ ئاوا به‌رده‌وام بێ ، ده‌بێ بیر له‌كارێ بكه‌ینه‌وه .»

ئه‌وانی‌تر وه‌لامیان دایه‌وه‌و گوتیان :

– «كاپتن گیان ، چیت گه‌ره‌كه بابیكه‌ین ؟ !» . پاش بیركردنه‌وه‌یه‌كی كورت گوتی :

– «به‌خوا ئه‌گه‌ر جه‌نابی فه‌رمانده رێ بدات ، ده‌بێ به‌زمێك بۆ خۆمان رێك بخه‌ین !» .

فه‌رمانده پرسی :

– «چۆن به‌زمێك ، كاپتن ! ؟» .

بارۆن گوتی :

– «گه‌وره‌م ، من هه‌موو شتێك رێك ده‌خه‌م ، مام دیووتی ده‌نێرم بچێته «رۆن»و چه‌ند ئافره‌تێك له‌گه‌ل خۆیدا بهێنێت . . من ئه‌زانم له‌كوێ‌دا هه‌ن ، ئیتر ئاهه‌نگێك سازده‌كه‌ین ، خواردن‌و خواردنه‌وه ده‌خورێته‌وه‌و ، هه‌رشتێكی پێ‌ویستیشه هه‌مان‌و ئاماده‌یه ، بێ‌گومان شه‌وێكی شادوخۆش راده‌بوێرین !

لێره‌دا كۆنت ڤۆن فارلسبرگ هه‌ردوو شانه‌كانی هه‌لته‌كاندو گوتی :

– «تۆ شێت بوویت ، هاورێم ؟»

كه‌چی ئه‌وانی دیكه هه‌لسانه سه‌رپێ‌و ده‌وره‌ی سه‌رۆكی‌یان داو به‌پارانه‌وه گوتیان :

– «لێ‌ی گه‌رێ گه‌وره‌م ، رێ‌ی بده با قسه‌كه‌ی جێ‌به‌جێ بكات ، ئێره زۆرناخۆشه ! !

مێجه‌ر هیچی پێ‌نه‌كراو ناچار پارانه‌وه‌كه‌یانی قه‌بوول‌كرد .

ئیتر خێراخێرا بارۆن ناردی بەشوێن پیرە «دیووتی» ، کە ئەویش کۆنە ئەفسەرێکی «سیلاحسز» بوو ، بەڵام هەرگیز رۆژێك زەردەخەنەیەکی بەسەر لێوەوە نەبینرابوو ! ئەگەر فرمانێکیشی پێ بسپێردرابوایە ، ئەوە بەتوورەیی یەکەوەو ، بەنارەزایی و بێ دەنگ جێ بەجێ ی دەکرد !

دیووتی هاتە ژوورەوەو لە پێشیانەوە بەروویەکی گرژو مۆن رەق راوەستاو گوێ ی دایە فرمانەکانی بارۆن ، ئینجا چووە دەرەوە . پاش پێنج دەقیقە گالیسکەیەکی سەربازیی کە چوار ئەسپ بەزەحمەت رایان دەکێشا ، لەکۆشکەوە دەرچوو بۆ نێو تۆفو بارانو ، زۆر بەتیژی تیپەڕیو بزربوو . ئەفسەرەکان جموجۆڵێکیان کەوتە ناوو گەش بوونەوە ، مولازم ڤۆن گرۆسلینك دڵنیای کردن کەوا بارانەکە سامالی لەدوایە ، هەرچی مادموازیل فیفی بوو هیچ ئۆقرەی نەدەگرتو لەهیچ شوێنێك رانەدەوەستاو ، هەر دەهاتو دەچوو ، چاوەکانی بەدوای شتێك دا دەسووڕانو دەگەڕان بۆ ئەوەی تێکی بداو بیپلیشێنێتەوە ، لەناکاو چاوی بڕی یە ئافرەتە بەسمێڵەکەو خێرا دەمانچەکەی دەرهێناو تێ ی گرتو گوتی :

- «تۆ نابینی !»

ئەمەی گوتو بێ ئەوەی لەجێ ی خۆی هەڵسێت ، نیشانەی لە تابلۆکە گرتو بەدوو گوللە بینایی چاوی کوژاندەوە ، لەدوایی بەهاورێکانی گوت :

- بالوغمێك دابنێینەوە !

بەخێرایی ئەوانی تر قسەکەیان بڕی ، وەك بڵێ ی شتێکیان بۆ خۆ خافڵاندن دۆزیبێتەوە ، چونکە تەقاندنو تێکشکاندن رەوشتی ئەو کابرایەبوو بۆ کات بەسەربردن .

خاوەن کۆشکەکە ، بەڕێز «کۆنت فێرناند داموێس (بوڤیل)» کە ماڵەکەی بەجێ هێشتو هەڵات ، ماوەی ئەوەی نەبوو شتە بەنرخەکان لەگەڵ خۆیدا بەرێ ، وەیا بیانشارێتەوە ، ئەو مرۆڤە چونکە خاوەن سامانبوو ، خولیاو هۆگری کۆکردنەوەی شتی بەنرخو عەنتیکەبوو ، بۆیە ژووری میوانانی گەورە دروست کردبوو ، ئەوەی سەیری بکردایە وەك مۆزەخانەیەك دەهاتە بەرچاو ، لەسەر هەموو دیوارەکاندا وێنەو تابلۆی زەیتیو ئاویی نرخدارو شتی دەستکردی عادەتی هەڵواسرابوون ، لەسەر مێزو رەفتەکانو ، لەنێو دۆڵابەکاندا هەزار جۆر گوڵدانو پەیکەر و ئەو بابەتانەی لە «چینی» دروست کرابوونو ، هەندێك شتی لەعاج دروستکراوو ، پەرداخیوا کە لەشاری ڤینیسیا کرابوون ، ئەو هەموو شتانە بە رێكو پێکیو بە ئەندازەیەکی هونەریو جوان دانرابوونو رێكخرابوون . بەڵام ئێستاکە ، بەدەگمەن نەبێ ، شتێك لەمانە بەساغو سەلامەتی بەجێ نەمابوو ، نەك لەبەر ئەوەی کە بڵێ ی دزرابن ، نەخێر ، چونکە ئەوەی راستی بێ فەرماندەکەیان دژی ئەم کارە بووو ، هەرگیز ماوەی نەدەدا روو بداتو بکرێ . بەڵام مادموازێل فیفی ناوەناوە دەیکردنە نیشانەو دەیشکاندنو ، ئەفسەرەکانی تریش یارمەتیان دەداو ، ئەوانیش ئەوەی بمابایەوە لەناویان دەبرد .

مارکیزی کورتە باڵا هاتە ژوورەوەو قۆرییەکی لە «چینی» دروست کراوی دەست دایەو لەگەڵ خۆیدا بردی بۆ ژووری نانخواردنو ، پڕی کرد لە باروودو فتیلێکی تێ هەڵکیشا ، لەپاشان بردیە ژووری میوانانو ئاگریداو بەرا کردن گەڕایەوەو دەرگای ژوورەکەی داخست ، خۆیشی لەتەك هاورێکانییەوە وەستاو بەدەم پێکەنینەوە وەك مناڵ چاوەڕوان بوو ! لەپڕ لەژوورەکەی تردا تەقینەوەکە روویدا ، کۆشكو خانووەکە هاتنە لەرزین .

هەموویان بەراکردنەوە بەرەو ژوورەکە چوونو مادموازێل فیفی لەپێشەوەی هەموویانەوەبوو ، هەرکە چاوی بەپەیکەری ڤینۆس کەوت کەسەری پەڕیبوو ، لەچەپڵەیداو . هاواریکرد ، ئەوانی تریش هەروەها ! هەموویان دەستیان کرد بەپشکنینی ناو ماڵەکەو پارچەی شتە شکاوەکانیان بەدەستەوە دەگرتو کەمێك تەماشایان دەکردو ، پاشان سەیری دەوروپشتی خۆیانیان دەکردو چاویان دەبڕیە ئەو شتانە کە لەسەر ئەرزەکە پەرتو بلاوبوونەوە .

فەرماندەکەیان هاتە ژوورەوەو کارە پیسەکەی دی ، بەچاوێکی پڕ لە پەشیمانییەوە سەیری ڕووداوەکەی کردو ، باوکانە سەیری ژوورەکەی دەکرد ، کە چۆن «نیرۆنیانە» وێران کرابوو ! ! زمانی گیرابووو . ســـەری سورمابوو ! کە چووە دەرەوەش بەناچاریو گاڵتە پیکردنەوە گوتی :

– ئەمجارە سەرکەوتنەکە بێ ئەندازەبوو !

لەبەر دووکەڵو بۆنی باروود ، بەزەحمەت هەناسەیان بۆ وەردەگیرا ، بۆیە پەنجەرەکانیان کردەوەو دەستیان کرد بەکۆنیاك خواردنەوەو ، نزیك پەنجەرەکان ڕاوەستان ، بایەکی شیدار خۆی دەکوتایە ژوورەوەو لەگەڵ خۆیدا بۆنی تەڕایی زەوی دەهێناو لەگەڵ ئەو سپرییەی تێکەڵ دەکرد کە لەرێشو سمێڵی خۆیانیان دابوو ، درەختەکانیش لەدەرەوە لەژێر زەبرو تەوژمی باران چەمابوونەوە ، گەڵییەکان تاریکایی باڵی بەسەردا کێشابوونو تەمو مژێکی ئەستوور داپۆشیبوون ، پیاوەکان سەیری ئەو دیمەنە جوانانەیان دەکرد ، ئینجا ڕوویان کردە قوللەی کڵێسەی دێیەکە کە تارماییەکەی لە دوورەوە وەك ڕەشاییەك لە نێو تاریکیدا بەدەر دەکەوت ، بەڵام لەو ڕۆژەوە کە ئەوان گەیشتبوونە ئەوێوە زەنگی کڵێساکە لێی نەدابوو ، ئەم کردەوەیەش خۆی لە خۆیدا خۆپیشاندانێکی بەرگرییانە بوو ، کە خەڵکەکە نیشانی داگیرکەرەکانی دەدا ، بەڵام بۆ شتی دیکە قەشەکەیان هەرگیز نەی گوتووە «نەء !» ، هەموو پێویستیەکی بۆ ئامادە کردوون ، وەك جێو شوێنو خواردن ، تەنانەت چەند جارێکیش لەگەڵیاندا پەرداخێ بیرەشی خواردۆتەوە .

فەرماندەکە چەند جارێ هەوڵیدا لەگەڵ قەشەکەدا پەیوەندییەك دروست بکاو لە ڕێگەی ئەوەوە لەگەڵ دانیشتوانی شارۆچکەکەدا دۆستایەتی پەیدا بکاتو قەشە لە نێوانیاندا بیێتە ناوبژیوان ، بەڵام هەموو ئەم کۆششانەی بەفیرۆ دەرۆیشتن هەرکە هەوڵی ئەوەی دەدا قەشە جارێك زەنگی کڵێساکە لێبدات .

قەشە لەو باوەڕەدا بوو کە بۆ ئەو خۆشترو چاکترە لەسێدارە بدرێ نەوەك زەنگێك لێ بدرێ ، ئا ئەمە بوو نموونەی بەرگری کردن دژی دوژمن ، کە بەرگرییەکی بێدەنگو بێزیانو ئاشتیانەبوو ، هەر ئەم ڕێگەشە کە شیاوی قەشەیەکی وەکو ئەوبێ ، کە ئادەمیزادێکی ئاشتی خوازە ، نەوەك شەر خواز ، ئەم ڕێبازەی ئەو ببووە هۆی ئەوەی هاووڵاتییەکانی پڕ بەدڵ خۆشیان بوێ ، سەبارەت بەو خۆڕاگرتنە بەهێزەو ئەو پاڵەوانیەتیەی نواندی بەچەسپاندنی ڕەش پۆشیو تازیمانە دانان لە ڕێگەی بێدەنگ کردنی زەنگی کڵێسەکە ، تەنانەت خەڵکەکە ئامادەبوون ببنە پاڵپشتێکی پتەو بۆ بەهێز کردنی وورەو باوەری شوانەکەیانو ، هەروەها هەموو شتێ تەرخان بکەن بۆ بەردەوام بوونی بڕیارەکە تاوەکو ببێتە پاسەوانێکی دڵسۆزو بێترس لە پێناو پاراستنی شەرەفی میللەتەکەیان !

ئەم کارە بووە نموونەی وولات پەروەری لەلایەن وەرزێرەکانو ، ئەوانیش وەك هەردوو پاڵەوانی مێژوویی «بلفورت وستراسبورگ» وا ئێستاکە شیاوی ئەم خاکەنو ، بەڵکو ئەتوانین بڵێین کە نموونەی پاڵەوانیەتی ئەوان یەکسان بەوانی تر . لە هەمان کاتیشدا ناوبانگی شارەکەیان بڵاودەبێتەوەو دەکەوێتە نێو مێژووو بەنەمری دەمێنێتەوە .

بەڵام ، جگە لەمە ئامادەبوون هەموو شتێك بدەنە پرووسیەکان ، هەرچی پرووسیەکانیش بوون لەناو خۆیاندا گاڵتەیان بەم «مەردایەتیە» دەکردو ، پێی پێدەکەنین ! چونکە هەموو دانیشتوانی شارۆچکەکە میوانداریی چاکیان دەکردن بەرامبەر بەمە ، ئەوانیش وازیان لێهێنابوونو ئازاریان نەدەدانو لێیان دەگەڕان ئەم وولات پەروەرییە بنوێنن بەگوێرەی ئارەزووی خۆیان ، تەنها مارکیز ویلهیلم نەبێ کە زۆر حەزی دەکرد زەنگەکە لێبدات ! زۆریش توورە بووبوو لە جۆری ڕێبازە سیاسییەکەی هاورێکانی بەرامبەر قەشەکە . . هەموو ڕۆژێ وەك ئافرەتێك چۆن لە پیاوەکەی دەپاڕێتەوە کە شتێکی بۆ بکرێ ، ئاوا لە گەورەکەی دەپاڕایەوە کە ڕێی

بدات‌و بچێت بەدەستی خۆی جارێك زەنگەکە لێ بدات ، بەڵام فەرماندەکە ئامادە نەبوو داخوازی‌یەکەی بۆ جێ بەجێ بکات ، هەر لەبەر ئەوەش بوو مادموازێل فیفی بەتەقاندن وتێکشکاندنی سەراکەی یوقیل رق‌و کینەی خۆی دادەمرکاندەوە .

هەر پێنج پیاوەکە لە شوێنی خۆیاندا بۆ ماوەی چەند دەقیقەیەك بەرامبەر پەنجەرەکە راوەستان‌و ، ئەو باشی‌دارەیان هەڵ دەمژی کە بەگوڕ دەهاتە ژوورەوە ، تا مولازم فریتز لە دوایی‌دا بە پێکەنینێکەوە گوتی :

– «دیارە ئافرەتەکان گەشتەکەیان خۆش نابێت لەگەڵ ئەم باو بارانەدا» .

ئەوسا بلاوەیان لێ‌کردو هەریەکەیان چووە سەر کارەکەی خۆی ، بەلام ئیشێکی زۆر چاوەروانی کاپتنی دەکرد ، وەکو ئامادەکردنی شوێن‌و ژەمی خواردن و خواردنەوەی شەوەکە .

کە ئەفسەرەکان جارێکی‌تر لەکاتی رۆژ ئاوابووندا کۆبوونەوە ، کەوتنە قاقای پێکەنین‌و سەیری یەکتری‌یان دەکردو پەنجەیان بۆ یەك دەبردو لەبەر پێکەنین دەکەوتنە سەرپشت ! ! چونکە هەریەکەیان خۆی جوان تاس‌و لووس دابوو ، ، جل‌و بەرگی جوان‌و پاکی لەبەر کردبوو هەروەك بۆ ئاهەنگێکی گرینگ وگەورە بچن ، هەرچی قۆڵۆنیاو لەوەنتەش هەبوو لە خۆیانیان دابوو ، تەنانەت قژی سەری فەرماندەش مووی سپی تێدا نەمابوو ! کاپتنیش ریشی تاشی بوو ، تەنها سمێڵەکەی لەژێر لووتی‌یەوە سوور دەبریقایەوە ، پەنجەرەکانیان هەر بەکراوەیی جێ‌هێشتبوو ، ناوە ناوە یەکێکیان دەچووە بەردەمی پەنجەرەکەو سەیرێکی دەرەوەی دەکرد ، تا لەکات ژمێری شەش‌و دە دەقیقە بارۆن گوتی : گوێم لە دەنگی سمی ئەسپەکانە ! هەر هەموویان بە پەلە بەرەو خوارەوە رایان کردو ، لەو کاتەیشدا گاڵیسکەکە لە حەوشەکەدا راوەستاو هەر چوار ئەسپەکان نەفەس بڕبووبوون‌و ، پشتیان تەروو قوراوی بوو ، هەڵم لە هەموو گیانیان هەڵ دەستا ، هێندەی پێ‌نەچوو پێنج کیژی

جوان لە گاڵیسکەکە هاتنە خوارەوە ، وا دیاربوو ئەو برادەرەی کاپتن کە لەگەڵ پیرە «دیووتی» نامەکەی بۆ ناردبوو ، ئافرەتەکانی جوان هەڵ‌بژاردبوون ، کیژەکان هیچ پێویستیان بەخۆرازاندنەوە نەبوو ، تەنانەت ئیشی خۆیشیان چاك دەزانی ، چونکە لە ماوەی ئەو سێ مانگەی کە پرووسی‌یەکان هاتبوون‌و ئەو ناوەیان داگیرکردبوو ، وای لێ‌کردبوون کە لێ‌یان رابێن چۆن لەگەڵیاندا بجووڵێنەوەو هەڵسن‌و دانیشن ! بەڵکو ئەم کارەیان بە ئەرکێك دەزانی . .

ئیتر هەموویان روویان کردە ژووری سفرە «خواردن» . هەرکە چراکان داگیرسان ، ژوورەکە زیاتر دڵتەنگی نواند لە ئەنجامی ئەو حاڵە شڕەی کە تیایدابوو ، لەسەر خوانەکە بەبێ ریزکردن‌و بەنارێکی جۆرەها فەخفوری‌و قاپ‌و پەرداخ‌و ملاك‌و چەتاڵ‌و چەقۆو شتی دیکە فڕێ درابوون . ئەم کەرەستانەیش هەمووی تازە لەنێو کولانکەیەکی یەکێ لە دیوارەکانی کۆشکەکەدا دۆزرابوونەوە ، کە خاوەنەکەی تیایدا شاردبوونی‌یەوە ، هەر بۆیە ژوورەکە وەك خانێکی دزان دەهاتە بەرچاو ، کاتێ کە دزەکان لەدزی دەگەڕێنەوەو دێنە شوێنێکی واو ، دەست دەکەن بەخواردنەوەو ، دابەش‌کردنی ماڵە دزراوەکە لە نێوان خۆیاندا .

کاپتن زیاتر لەوانی‌تر بەجم‌و جۆڵ‌بوو ، بەرپرسیاری‌ی ئافرەتەکانی خستە ئەستۆی خۆی وەك ئەوەی لەوانی دیکە چاکتر بیان ناسێت ، ناوە ناوە گوێی دەدایە راوو تەگبیریان‌و ، جار جارەیش ماچی دەکردن‌و ستایشی دەکردن ، کاتێ کە سێ ئەفسەرەکەی تر ویستیان هەریەکەیان کیژێك بۆ خۆیان هەڵ بژێرن . کاپتن نەیهێشت‌و بۆی روونکردنەوە کە ئەم ئەرکە خۆی پێی هەڵ دەستێ‌و هەر ئەو ئەم مافەی هەیە ! چونکە ئەم دابەش‌کردنە دەبێ بەپێی پلەو روتبەیان بێ ، تاکو یاسای «پێشترو پاشتر – الاسبقية» تێك نەچێ ! بۆ ئەم مەبەستە دەستی کرد بە پرسیار کردن لەناوی کیژەکان : یەکەمیان گوتی : ناوم پامێلایە . کاپتن گوتی :

– «ژماره یەك ، پامیلا ، بەشی فەرماندەمانە» . دوای ئەم ، کیژێکی تری ماچ کردو ناوەکەی پرسی ، ئەویش ناوی «بلۆندین» بوو ، ئەوەیان بۆ خۆی هەڵبژارد . «ئەماندای» خڕین و قەڵەویشی دایە مولازم ئۆتۆ ، وە «ئیڤای» ناسراو بە «تەماتە»ی کردە بەشی مولازمی دووەم فریتز . دوا کیژیش «ڕاشێل»ی ناوبوو ، بەبالاّ لە هەموویان کورتتربوو ، کیژێکی بچووك و ئەسمەرو خاوەن دوو چاوی ڕەشی وەك مەرکەبی ڕەش ، کیژێکی جوولەکەبوو ، بەڵام لووتی پانبوو ، بەپێچەوانەی هاوولاّتی یەکانی ، کە ئەمە لەنێو جوولەکەکان باو نی یە ! ئەمەیانی دایە گەنجترین ئەفسەر ، مارکیز ویلهیلم ڤۆن ئێریك ، کە بە مادموازیل فیفی بەناوبانگ بوو لەنێو هاوڕێکانی دا .

ئەوەی ڕاستی بێ کیژەکان هەریەکەیان بەجۆرێك جوان بوو ، هەموویان بەژن و بالاّرێك و پتەو بوون ، هیچیان شتێکی زیاتر وەیا کەمتریان نەبوو لەوانی تر کە پێی جیا بکرێنەوەو هەر لەیەکیش دەچوون ، بەشێوەو بالاّو جوولانەوەو هەڵس و کەوت ، چونکە لەو جۆرەکارە ڕاهاتبوون ، کە ئەویش ژیان بەسەر بردنە لەنێو ئەو کۆمەڵە ئافرەتانەی کارو پیشەیان خۆشی ی بەپیاو بەخشینە لە ڕێگەی سەماو ڕابواردنەوە . .

سێ ئەفسەرە گەنجەکان بەو هیوایە بوون ماوەیان بدەن هەریەکەی ئافرەتەکەی خۆی هەڵگرێ و بیباتە خلوەتێ ، بەو بیانووەی کەوا کیژەکان دەیانەوێ خۆیان ڕێك بخەنەوەو برازێنەوە .

بەڵام هەرچی کاپتنەکە بوو نەیهێشت و پێی گوتن کە کیژەکان جوانن و هیچ پێویستیان بەخۆڕازاندنەوە نی یەو ڕاستەوخۆ ئامادەن بۆ ئاهەنگ گێڕان ! بەم جۆرە هەموو دانیشتنەوەو دەستیانکرد بەخواردنەوە ، گفت وگۆو پێکەنین و هەرا دەستی پێکردو ماچ و موچی کیژەکانیش پەرەی سەند . .

لەپڕ ڕاشێل هێڵنجی هاتەوەو هێندەی نەمابوو بخنکێ و گەڵێك کۆکی ، تومەز کابرای هاوڕێی – واتە مادموازێل فیفی ، لەکاتی ماچکردنیا ، قورگی کچەکەی پڕی دووکەڵی جگەرە کردبوو ، دوای کۆکینێکی زۆر ، کچە ماتبووو ، هیچ خۆی نەشێواند ، بەڵام تووڕەیی خۆی بە تەماشا کردنێکی پڕ لە کینەو بەچاوە ڕەشەکانی یەوە دەری دەبڕی . .

دوای ئەم بەزمە ، هەموویان لە دەورەی مێزی نان خواردندا دانیشتن ، فەرماندەکەیان زۆر کەیف خۆشبوو ، کامەرانی ی بەسیماوە دیاربوو چونکە پامیلای لەلای ڕاستەوەو بلۆندینی لەلای چەپی یەوە دانیشتبوون ، هەر لە خواردنیش بوونەوە ، فەرماندەکە هەستی خۆی دەربڕی و گوتی :

– «تەگبیرێکی گەلێك شیاوو زۆر جوان بوو لەلایەن تۆوە ، ئەی کاپتن .»

هەرچی لێفتنانت «مولازم» ئۆتۆ و فریتز بوون ، بە ئەدەب دانیشتبوون و لەگەڵ کیژەکانیاندا ڕێك دەجوڵانەوە ، وەك بڵێی لەگەڵ دوو ئافرەتی بەشەرم و پاك دانیشتوون ، چونکە کەمێك دەترسان و شەرمیشیان لە دراوسێکانیان دەکرد ، هەرچی «بارۆن»یش بوو ، بە پێچەوانەی ئەوانەوە ، ئارەزووەکانی پەرەی سەندبوو لەبەر خواردنەوە ، بەخۆیو بەقژە سوورەکەیەوە کە لەتەوقی سەریەوە هاتبووە خوارەوەو بەسەر دەم و چاوو گوێچەکەکانیدا پەرت بلاّو ببوونەوە ، دەتگوت ئاگری تێبەربووەو دەسووتێ ، ستایشی جوانی ی کیژەکانی دەکردو سەرنجی سەیر سەیرو نارەوایشی دەردەبڕی ، بەو زمانە فەرەنسی یە شەق و پەقەی کە دەیزانی ، ئەوەی زۆریش ناشیرین بوو ، ئەو پریشکە تفانە بوون کە لە دەمی یەوە دەهاتنە دەرەوەو ، لە کەلەنی نێوان ددانەکانی پێشەوەی دا دەردەپەڕی و بەدەم و چاوی کیژەکان دەکەوت ! ئەڵبەتە کیژەکانیش هیچی لێ تێنەدەگەیشتن .

هەراو پێکەنین و هاوار زیاتربوو ، پیاوەکان خۆیان فڕێ دەدایە ئامێزی ئافرەتەکان و قسە ناپەسندەکانی «بارۆن»یان دووبارە دەکردەوەو ، خۆیشیان قسەی هەلەق بەلەق تریان

دەدایە پاڵ کیژەکانیش مەستو سەرخۆش بووبوونو ئەوانیش بەگوێرەی ئارەزووی پیاوە هاورێکانیان ووشەی ناشیرینو پیسیان لە دەم دەردەچوو ، بەم جۆرە ڕەسەنایەتیان بەدەرکەوت ! ! یەکێکیان لاسمێڵی چەپی پیاوەکەی خۆی ماچ دەکرد ، ئەوی‌تر لای ڕاستی ، یەکی‌تر نقورچەی لە ڕانی کابرای تەنیشتی‌یەوە دەدا ! هەندێکیشیان بە دەنگێکی بەرزەوە یەك دوو کۆپلەی گۆرانی‌یەکی ئەڵەمانیان دەگوت کە لە دەمی ئەمو ئەو فێری بووبوون ، ئەڵبەتە ئەویش لەبەر دانیشتنی زۆرو ڕابواردنیان لەگەڵ سەربازە ئەڵەمانی‌یەکاندا .

لەم سەینو بەینەدا ئارەزووی لەشی پیاوەکان کلپەی دەسەندو دەستیان کرد بەفڕێدانو پەرتو بڵاوکردنەوەی قاپو پەرداخو کەلو پەلی سەرمێزەکە .

سەربازەکانی دەورو پشتیشیان زیاتر لەو شتانەیان دەدایە دەستیان بۆ ئەوەی بی‌پلیشێننەوە ، تەنها فەرماندەکەیان خامۆشو بێ‌جولانەوە دانیشتبوو ، ماتو بێ‌دەنگ‌بوو ،

هەر تەماشای ئەفسەرەکانی خۆی دەکرد ، هەرچی مادموازێل فیفی بوو ڕاشێلی لەسەر چۆکی خۆی دانابوو و بەردەوام بۆنی دەکردو لەشی نەرمو نیانی کچەکە ، تەزووی ئارەزووە سێ کسی‌یەکانی لەناو دەروونی‌دا گڕی گەرم بووبوو ، جار جارەیش سەری شۆڕ دەکردەوە سەر کەلەنی کراسەکەی کە لە ملی‌یەوە بەرەو خوار لەسەر شێوەی ژمارە «٧»دابوو ، سەیری سینەی کچەکەی دەکرد ، ناوە ناوەش نقورچێکی توندی لە ڕانی گیر دەکردو وای لێ‌دەکرد یەك بەلای ڕاچڵەکی‌و ڕاپەری‌و ، پڕ بەدەمی هاوار بکات . چونکە ئەو مرۆڤە خوو ڕەوشتی تەنها ئازاردانی خەڵکی بێ دەسەڵات‌بوو ، هەندێ جاریش کچەکەی لە ئامێز دەگرتو توند دەیگوشی‌و لێوەکانی خۆی دەخستە سەر لێوی‌و ، بە هەموو هێزی‌یەوە بەددانەکانی هەردوو لێوی دەگەزی ، تا وای لێ‌دەهات خوێن لێ‌یانەوە دەردەپەڕی‌و بەسەر دەمو چەناگەو گەردنی‌دا دەهاتە خوارەوە ، تا جارێکیان کچکە هێندە بێزاربوو ، دوای ووشك کردنەوەی خوێنی لێوەکانی ڕووی تی‌کردوو گوتی :

— «دەبێ نرخی ئەمەم بدەیتی !»

ئەویش بە گاڵتەو پێکەنینێکی بەرزەوە گوتی :

— «بەڵێ . . دەیدەم» .

لە کۆتایی‌دا شەمپانیان بەسەردا گێڕان ، فەرماندە هەڵسایەوە سەرپێی‌و پێکی خۆی بەرزکردەوەو گوتی :

— «چەریۆ ! بۆ خانمەکانمان !» .

بەمە ڕێی بۆ ئەوانی تریش کردەوەو ، هەر یەکە بەجۆرێ دەیخواردەوەو قسەیەکی دەکردو ، تەنانەت قسەو ووشەی ناشیرینیش دەگوترا ، چونکە زمانەکەیان بەچاکی نەدەزانی . ئیتر زوربەی ووتەکانیان مانای سەیریان دەگەیاند ، هەر بۆیە هێندە پی‌دەکەنین تا دەکەوتنە سەرپشتو چەپڵەیان لێ‌دەدا .

لە ناکاو کاپیتن پێکی خۆی بەرزکردەوەو گوتی :

— «بۆ سەرکەوتنمان و داگیرکردنی ئەم دڵانە !» .

دوای ئەوەی کاپتن ئەم قسەیەی‌کرد ، لێفتنانت ئۆتۆ سەرخۆشی کاری تێکردبوو ، هەڵسایەوەو ، وەکو شێتێك هاواری کردو گوتی :

— «بۆ زاڵ بوونمان بەسەر فەرەنسادا !» . ئافرەتەکان زۆر سەرخۆش بووبوون ، کت‌ومت دانیشتبوون . بەڵام ئەم قسەیە کاری تێکردن ، هەر بۆیە ڕاشێل گوتی :

— «من هەندێ پیاوی فەرەنسایی دەناسم . کە تۆ لە بەرامبەر ئەوانەوە قەت ئەو ئازایە نیت ئەم قسەیە بکەیت . .»

مارکیز ، کە هێشتا کچەکەی هەر لەسەر چۆکی‌یەوەبوو . بەتوندی لە ئامێزی خۆی گرتبوو ، دایە قاقای پێکەنین . چونکە مەی وا مەستی کردبوو ببووە مرۆڤێکی گاڵتەچی‌و نوکتەبازو . گوتی :

— «ها ! ها ! ها ! من بەخۆم تووشی هیچیان نەبوویم ، بەڵام هەرکە بۆیان دەرکەوین ، خۆیان ناگرن‌و هەڵ دێن .» .
بەڵام کچەکە بە تووڕەیی‌یەکەوە سەیری سیماو نێو چاوانی کردو ، هاواری کردو گوتی :
— «تۆ ئەی پیسی بەدفەڕی ناپەسند ، درۆ دەکەیت !» .
پیاوەکە بە دوو چاوە شینەکەیەوە بۆ ماوەیەکی کورت تەماشایەکی کردو ، ئینجا هەر بەهەمان سەیرکردنی ئەو وێنەیەی کە بە دەمانچەکەی شکاندی ، بە کچەکەی گوت :
— «ئا ، باشە ، با باسی‌ن بکەین ، جوانەکەم ! ئایا ئەگەر ئازا بوونایە وەك دەفەرموویت ، ئێمە لێرە دەبووین ؟» .

لە پاشا بە تۆزێ تووڕەیی‌یەکەوە گوتی :
— «ئێمە گەورەیانین ، فەرەنسا بۆ ئێمەیە !» .
کیژەکە لە سەر چۆکی کابرا ڕاپەڕی‌و لەولاوە لەسەر کورسی‌یەك دانیشت ، پیاوەکەش هەڵساو پێکەکەی بەرز کردەوەو ، لە دیوەکەی تری مێزەکەوە قسەکەی خۆی دووبارە کردەوە :
— «فەرەنسا هی ئێمەیە ، فەرەنسایی‌یەکان ، دارستانەکان ، کێڵگەکان‌و خانووەکانی فەرەنساش هەمووی موڵکی ئێمەیە !» .

پیاوەکانی‌تر ، ئەگەرچی مەی بە یەکجاری بێ هۆشی کردبوون ، بەڵام لەم مشت‌و مڕەدا ، هەستی سەربازیەتی‌و گیانی پرووسیایەتی لە لەشیانا جوڵایەوەو ، دڕندانە هەموویان پێکیان بلند کردو گوتی‌یان :
— «بژی پرووسیا !» .
ئینجا بەیەك قوم پێکەکانیان بەتاڵ کردە نێو زگیانەوە ، کچەکان ووڕتەیان لێوە نەهات ، چونکە چووبوونەوە دونیایەکی تری مەستی‌و خامۆشی‌و پڕ مەترسی‌یەوە ، تەنانەت ڕاشێلیش هێزی قسەکردنی نەمابوو ، بێ‌دەنگ بوو بوو . مارکێزی کورتە بالا پێکەکەی خۆی لەسەر سەری کچە بێ‌دەسەلات‌و بێ‌دەنگەکە داناو هاواری کرد :
— «هەموو ئافرەتەکانی فەرەنساش هی ئێمەن .» .
ئا لێرەدا کچەکە هەڵسایە سەرپێی‌و شەرابە عەنبەری‌یەکە هەموو ڕژایە نێو قژە زووخاوی‌یەکەیەوە ، وای لێهات وەك یەکێك لە ئاودا هەڵ‌کێشرابێ ، ئینجا کەوتە خوارەوەو پەرداخەکەیش شکا . بەدوو لێوی بە ترس‌و لەرزەوە ، بە ئەفسەرەکەی گوت ، کە هێشتا هەر پێ‌ دەکەنی . .
— «ئەمە . . ئەمە ڕاست نی‌یە . . . چونکە من دڵنیام کە تو تەنها یەك ئافرەتی فەرەنساییت چنگ نەکەوتووەو ناکەوێ تا ڕەزیلی بکەیت . .» .
کابرا دانیشتەوەو پێکەنینەکەی تەواو بوو ، هەوڵی‌دا بەشێوەی زمانی فەرەنسی قسە بکات‌و گوتی :
— «باشە . . زۆر باشە ئازیزەکەم ، کەوابێ پێم بڵێ ئێوە چین‌و ؟ بۆچ لێرەن ؟ !» .

کیژەکە بو ماوەیەك واقی وورمابووو ، ڕەق ڕاوەستابوو ، هەروەك یەکێك برووسك لێ‌ی بدات ، چونکە بە یەکەم هەل لە مەبەستەکەی حاڵی نەبوو ، بەڵام دوای ئەوەی واتای قسەکانی ئەفسەرەکەی لەلا ڕوون بووەوەو تێ‌یانگەیی ، بە نارەزایی‌یەکەوە هاواری کرد :
— «من ؟ من ئافرەت نیم ، من پیس‌و ناپاکم ، پرووسیەکانیش هەر ئەوەیان لێ‌ دەوەشێتەوە !» .

هێشتا کچەکە لە قسەکانی نەبووبووە ، کابرا شەقازلەیەکی توندی پێدا کێشاو ، ویستی یەکی تریشی لێ‌بدات ، بەڵام ، کە دەستی بەرزکردەوە ڕاشێل نەیکردە نامەردی‌و چەقۆیەکی میوەی لەسەر مێزەکەوە ڕفاندو ، هەر هێندەی چاو نووقانێکی پی‌نەچوو کە بەهەموو هێزی‌یەوە چەقۆکەی لە هەوراز قورقوڕاگەی ملی کابرا گیر کردوو تی‌ی چەقاند ، ئیتر خوێن فیچقەی کرد ، بۆ ماوەیەك کەس ئاگاداری ڕووداوەکە نەبوو ،

چونکه هێندە ئازایانەو بە خێرایی و سووك دەستی کارەکەی ئەنجامدا ئەوانەی دیکە هەستیان پێ نەکرد ، بریندارەکە خەریك بوو شتێ بڵێ و قسەیەك بکات ، بەڵام ، ووشەکان لەنێو قورقوراگەیدا گیریان دەخواردو نەدەهاتنەدەرەوە ، بۆیە هەر لە جێوە دانیشت و دەمی بەنیوە کراوەیی مایەوەو ، چاوەکانیشی بەکراوەیی دیمەنێکی پڕ مەترسی یان دەنواند .

کە ئەفسەرەکان ئەمەیان بینی ، هەریەکە لە جێگەی خۆیدا بەترسەوە بەرەو کچەکە بازیدا ، بەڵام کچەکە گورج کورسی یەکی هەڵگرت و فڕێی دایە بەر پێیان ، لێفتنانت ئۆتۆ کەوتە سەری و یەك بەزەوی یەکە راکشا ، کچەکە بەغار خۆی گەیاندە پەنجەرە کراوەکەو خێرا خۆی فڕێدایە خوارەوەو ، بازی دایە دەرەوەو ، لە نێو تاریکیدا بزر بوو ، لەوەش زیاتر هاژەی باو باران زیاتر وونیان کرد . .

لەماوەی دوو دەقیقە مادموازێل فیفی بووە لاشەیەکی ساردوسوڕی بێ هەست و بێ نەفەس ، لەولاشەوە فریتزو ئۆتۆ «قامەکانیان» رووت کردەوەو بەتاو پەلاماری ئافرەتەکانی دیکەیان داو ویستیان بیانکوژن ، بەڵام ، ژنە لەترسا رەق بووەکانو ، بێدەسەڵاتەکان خۆیان فڕێدایە بەر پێی ئەفسەرە توورەکانو ، توند قاچەکانیان گرتن و پارانەوە ، گەر مێجەرەکە نەبوایە کوشتارێکی درندانەو نارەوا رووی دەدا ،

مێجەر بەچ حاڵێ توانی هەر چوار کیژەکە لەدەست دوو ئەفسەرەکە رزگار بکات و ، بەرەڵلایان بکات و ، لەژوورێکی پەستن و دەرگاکەی لەسەر کلیل دانو ، دوو سەربازی ئێشکچیشی لەبەر دەرگاکە دانا . ئینجا کەوتە پلان دانان و کۆشش کردن بۆ راوانانی کیژە تاوانبارەکەو دۆزینەوەی ، لەو باوەرەش دابوو کەوا هەر دەیدۆزنەوەو دەگیرێ ، پەنجا کەسی بەزۆر نارد بۆ ئەوەی نێو باخەکە بپشکنن و ، دوو سەدی تریشی نارده نێو دارستانەکە تا هەموو ئەو کەندو هەردو گەڵی و کۆڵێتانەی ئەو ناوە بگەڕێن بە شوێن کچە کەساسەکە .

لەدوای ئەم بگرەو بەردەیەدا ، مێزەکە پاك کرایەوە ، هەموو ئەو کەل و پەلەی لەسەریابوو هەڵگیرا ، دوای ئەوە لاشەی ئەفسەرە کوژراوەکەیان لەسەری درێژکردو ، بۆیان کرد بەتابووت ، لەولاشەوە هەر چوار ئەفسەرەکان مات و غەمگین لەلای پەنجەرەکەوە راوەستاون و ، لە پشتەوەشیان هەموو سەربازە خزمەتکارەکان راوەستان ، هەمووشیان چاویان بڕیبووە تاریکایی یەکەی دەرەوەی پەنجەرەکەو نێو بارانەکە ، وەك بڵێی بیانەوێ پەردە لادەن و شتێك لەنێو تاریکایی یەکەدا بەر چاو بکەن .

لە دووریشەوەو ، لەنێو ئەو تاریکستانەدا ناوە ناوە تەقەی تفەنگێك دەهات و بۆ ماوەی چوار سەعات ئەم تەقەو دەنگە بەردەوام بوو ، جارناجارێکیش گوێیان لە چریکەو هاوارێك دەبوو کە لە دەرەوە دەهات ، یا هاوارێکی فریاکەوتن و قسەی بێواتا دەبیسترا ، بەڵام لەبەر دەنگی باو باران وهەوره تریشقە کەس تێی نەدەگەیشت . .

بۆ بەیانی هەموویان گەرانەوە دواوەو ، دووسەربازی تریشیان لێ کوژرابوون و ، سیانی تریشیان بریندار کرابوون . هەر بەفیشەکی هاورێکانی خۆیان . چونکە لەبەر تاریکی یەکتری یان نەناسیبوو زیاتر سەری لێ شێوان بوون . ئەمە جگە لەوەی کە هەموو ماندوو بوونیشیان بە فیرو رۆیی و رێشێیشیان نەدۆزی یەوە ، دوای ئەو رووداوە . خەڵکەکە ئازار دران و . ماڵ و کەل و پەلیان سەروو بن کراو هەموو دەوروبەری دێیەکە بست بەبست پشکنرا ، کەچی کەنیشکەکە هیچ شوێن و ئەسەرێکی لەپاش خۆیدا بەجێ نەهێشتبوو .

کە ئەم کارو رووداوە لە ژەنەراڵ گەیەنرا . فەرمانی دا کە شتەکە بشارنەوەو باسی نەکەن و پشتگوێی بخەن . تاوەکو نەبێتە نموونەیەکی ناشیرین و خراپ بۆ سوپاکەیان . لە هەمان

کاتیشدا بەتوندی لۆمەی فەرماندەکەی کرد ، ئەویش لە رقان هەموو ئەوانەی لە خۆی بەرەو خوارتری سزادان ، کە لە دوورو نزیکەوە پەیوەندییان بە رووداوەکە هەبوو ، چونکە ژەنەرال بە لۆمەکردنەوە پێی گوتبوو :

– «کاکە ، شەرو سەرکەوتن بە رابواردنی خۆشو خەوتن لە نێو کۆشی گەرمو ، ئامێزی ئافرەتە داوێن پیسەکاندا وەدەست ناهێنرێ» .

لەسەر ئەم قسەیە خەریك‌بوو جامی تورەیی خۆی بەسەر هەموو هەرێمەکەدا دابرژێنێ بۆ تۆڵە سەندنەوەی خۆی ، بەڵام چونکە پێویستی‌ی بە بەڵگەیەك هەبوو بۆ ئەنجامدانی ئەم کارە ، ناردی بەشوێن قەشەکەو ، فرمانی پێ‌دا کەدەبێ لەکاتی گواستنەوەی تەرمی مارکیز ڤۆن ئیریكو تێپەربوونی بەو شوێن‌و رێگەیەدا ، زەنگی کڵێسەکە لێ بدا .

بەڵام ئەمجارەیان بە پێچەوانەی بیرو باوەری خەڵکی دێیەکە ، قەشە فرمانەکەی پەسندکرد ، ئیتر کە تەرمی مادموازێل فیفی بەسەرشانی سەربازەکانەوە بووو ، کۆشکی یوڤیلی بەجێ هێشت‌و بەوێ‌دا رەت‌بوو – واتە بەنزیك کڵێسەکەدا – بۆنێو گۆرستانی دێیەکە ، هەر لەوکاتەوە زەنگی کڵێسەکە لێ‌دراو دەنگی لێوە هات‌و ، لەسەر ئاوازێکی تایبەتی کە بۆ ئەو جۆرە بۆنانە لێ‌دەدرا ، بەردەوام‌بوو ، هەروەك بڵێی دەستێکی نەرمۆڵە زەنگەکە لێ دەدات ، بەڵێ دەنگی زەنگەکە دووبارە دەنگی‌دایەوە ، ئیتر ئەو رۆژەو ، پاشترو ، رۆژانی تریش هەر نەبرایەوە . . . !

بەڵێ ، هێندە لێ‌دەدرا تاکو بڵێی بەس ! تەنانەت هەندێ‌جار ، لەسەعاتەکانی دوای نیوە شەویش یەك دوو زنگەی نەرمۆڵەی لێوە دەهات‌و دەنگی دەدایەوە ،لە تاریکایی شەوی دەیجوور دانیشتوانی ناوچەکە گوێیان بۆ شل دەکرد و بەدڵێکی خۆش‌و هەستێکی غەریب کەکەس نەی دەزانی لەبەرچی وابوو . هەندێ کەسیش وای بۆ دەچوون کە زەنگەکە سیحراوی‌یەو ، بەلای‌دا نەدەرۆیشتن ، تەنها قەشەو مجێورەکە نەبێ کە هەردووکیان دەچوونە لای قوللەی زەنگەکە ، چونکە کچێکی هەژارو لێ‌قەوماو بەتەنهایی‌و بەدڵێکی پر لە مەترسی‌یەوە لەوی‌دا دەژیا ، ئیتر هەر جارەی چ خواردن‌و خواردنەوەیەك هەبوایە بۆیان دەبردو ، چەند قسەیەکیشیان لەگەڵ‌دا دەکردو دڵیان دەدایەوەو . لەحەشارگەکەدا ورەیان بەهێزتر دەکرد .

ئەم کیژۆڵەیە هەر لەوێ مایەوە تاوەکو ئەو تیپە داگیرکەرە ئەڵەمانیایی‌یە لەوێ رۆشتن‌و ئەو شوێنەیان بەجێ هێشت . لە دوایی‌دا قەشەکە گالیسکەکەی نانەوای دێ‌کەی بەکرێ گرت‌و ، بەشەو رێ‌ی گرتە بەرو ، کیژە بەندکراوەکەشی گەیاندە دەروازەی شاری «روا» ، لەوێ دەستیان لەملی یەکتری کردو کیژە بەخێرایی گەرایەوە ئەو دەزگایەی کە لێ‌ی دەرچووبووو ، چووبوە «یوڤیل» ، ئافرەتە سەرەك دەزگاکەیش وای زانیبوو مردووە .

دوای چەند رۆژێك بەسەر گەرانەوەی راشێل‌دا ، رۆژێکیان هاوولاتی‌یەکی ئەو شارە گەیشتە ئەو قەناعەتەو لەوە دڵنیابوو کەشەرەف‌و مەردایەتی‌و پیاوەتی بەخوازبێنی کردنی ئەم کچە کەم نابێتەوە ، ئیتر کیژەکەی خۆش‌ویست‌و چووە خوازبێنی بو ئەوەی داوای لێ‌بکات رازی بێ‌شووی پێ بکات ، چونکە بەلای ئەوەوە ئەو کارە گەورەو پیاوەتی‌یەی ئەو کچە لە پێناو وولاتەکەیدا کردی ، مایەی شانازی‌و سەربەرزی‌یە ، بەم جۆرە کچەی کردە ئافرەتێکی پاك سەربەرزو چاك ، هەر وەك زوربەی خانمە چاکەکانی دیکە !

● سەرچاوە :

Guy De Maupassant.




شانۆگەری یەك پەردەیی

# چاوپێکەوتنێکی رۆژنامەنووسانە

ئامادەکردنی : یاسین قادر بەرزنجی

کاراکتەرەکان :

١ - **وریا** : رۆژنامەنووس و ئەدیبە . تەمەنی سی ساڵێکە .

٢ - **ئەنوەر** : رۆژنامە نووسە . بەتەمەن لە وریا گەورەترە . پیاوێکی رووخۆشە .

٣ - **سەرنووسەر** : کابرایەکی مرۆمۆنە . تەمەنی نزیك پەنجا ساڵێکە .

٤ - **بەشیرفە محوڵلا** : شاعیرە . تەمەنی ژوور پەنجا ساڵە .

سەر شانۆ دیکۆری ئامادەکراوی هەیە . بریتین لەدیمەنی نووسینگەی سەرنووسەری گۆڤارێك . ژووری

ڕۆژنامەنووسەکان ، یەکێك لە ژوورەکانی ماڵی بەشیر فەتحوڵڵای شاعیر. ڕوناکی دیمەنەکان دەرئەخات و ڕووداوەکان پێکەوە گرێ ئەدات . . سەرەتا ڕوناکی ئەچێتە سەر ژووری ڕۆژنامە نووسەکان ، وریاو ئەنوەر دانیشتوون ، ئەنوەر بە چەند پەرە کاغەزێکەوە خەریکەو وریاش بە دەم جگەرە کێشانەوە بیرئەکاتەوە)

ئەنوەر : بەپێچەوانەی هەموو بەیانی‌یەکەوە ، بێ ئیش دانیشتوویت و بەهیچەوە خۆت خەریك ناکەیت . . سەیرە !

وریا : ها . . . بڵێم چی . . تاقەتم نی‌یە . .

ئەنوەر : چۆن ئەبێت وریای ڕۆژنامەنووس و چیرۆکنووسی لاو بەم شێوەیەبێت ؟ . هەرگیز نابێت !

وریا : بۆ نابێت ؟ ! گەر مامۆستا ئاوا سەرو دڵمان بگرێت حەوسەڵەی هیچمان ئەمێنێت ؟ !

ئەنوەر : یاڵڵاخێر ، هیچی تازە ڕووی‌داوە ؟

وریا : ئەی دوێنێ پێم نەوتیت چاوپێکەوتنی ڕۆژنامەنووسانە لەگەڵ بەشیر فەتحوڵڵای گەورەی شاعیران بە جەنابم سپێررا .

ئەنوەر : ئەی نەتووت خۆتی لێ نەجات ئەدەیت ؟

وریا : نازانم ، دوێنێ دەوام ئەوەندەی بەبەرەوە نەمابوو ، سەرنووسەر دای بەگوێمدا ، مەعلووم ئەمرۆ بانگم ئەکاتەوە . .

ئەنوەر : خوا بەوە ڕەحمی کردووە ئیشی من کاروباری وەرگێڕانە ، تووشم بە تووشی ئەو جۆرە . . (بە گاڵتە پێ‌کردنەوە) ئەو جۆرە شاعیرانەوە نابێت ، ببورە ، تۆ خۆشت ئەدیبیت و خولیای شیعریشت زۆرە ، مەبەستم لەوەیە من بە پێی فرمانەکەم ناچمە خزمەت ئەو چەشنە شاعیرانە . .

وریا : کاکە گیان ، قەیناکە ئەدیبم ، بەڵام دەست نیشان‌کردنی کەسێك بۆ گفتوگۆو چاوپێکەوتنی ئەدەبی ئەبێت لەلایەن ڕۆژنامەنووسی خۆیەوە بێت ، یەك ساڵی ڕەبەقە بە سەرنووسەر ئەڵێم با چاوپێکەوتنێك لەگەڵ حسەینی چیرۆکنووسدا سازبکەم ، هەر جارەو بەبیانوویەك داواکەم ڕەت ئەکاتەوە ، دووا جار پێی وتم : کاکە ، حسەین بەم تەکنیك و مەکنیك و بەزمی نوی‌کاری‌یە چیرۆکەکانی شێواندووە ، تۆش لێی گەڕێ !

(زەنگی تەلەفون لێ‌ئەدرێت و ئەنوەر هەڵی ئەگرێت)

ئەنوەر : هەلاو ، بەڵێ ، سەرچاوم ، خۆش‌بیت ، بەڵێ ، بەڵێ لێرەیە ، بۆلای خۆی ، باشە برا ، بەسەرچاو ، خوات لەگەڵ ، (تەلەفونەکە دائەخاتەوە) سکرتێربوو ، سەرنووسەر تۆی ئەوێت .

وریا : یائەڵڵا . . مەسەلەکەیە ، چوونە خزمەتی فەتحوڵڵا بەشیر .

ئەنوەر : (پێ‌ئەکەنێت) ها . . ها . . ها . . بە جۆرێك شپرزەی کردوویت ناوەکەشیت عەکس کردەوە ، هەر گوێشی مەدەرێ ، بەشێوازەکەی خۆت چاوپێکەوتنێکی وای لەگەڵ بکە کە دوایی مەراقی پێوە نەخوێت . . مردووت نەمرێت . چیتە ، خۆ تۆ لەسەر هیچیش بنووسیت ، گەر مەبەستت بێت لەو هیچە شتێك ئەخولقێنیت .

وریا : نا . . . چۆن ؟

ئەنوەر : بەسەری خۆم بەڕاستمە ، بتەوێت لەسەر مردوو ئەنووسیت و وای لێ‌ئەکەیت خوێنەر وابزانێت گەورەترین و کاریگەرترین نووسەری ناوزیندووانە ! . خۆ گەر بشتەوێت ئەوا . .

وریا : (قسەکە بەئەنوەر ئەبڕێت) ئەوا زەلامی زرت و

زیندوو بەچوار پەلەوە لە گۆڕ ئەنێم . کاك ئەنوەر ، چیتە ، نەبڕایەوە ، هەموو جارێ ئەم قەوانە لێ‌ئەدەیتەوە ، بێ‌قەزابیت !

ئەنوەر : کاکە وریا ، دوواکەوتیت ، سەرنووسەر چاوەڕێتە ، ڕۆحەکەم عاجز نەبیت ، لەسەر ئەوەمان نەکردووە .

وریا : بەڕاست ، با بچم بەلایەوە .

(وریا ئەچێتە دەرەوەو ئەنوەریش دەست ئەکات بەنووسین ، شانۆ تاریك ئەبێت‌و لەگەڵ مۆسیقایەکی کورتدا ڕوناکی ئەچێتە سەر ژوورەکەی سەرنووسەر ، ئەو دانیشتووەو وریاش بەپێوە لە بەردەمی مێزەکەیدا وەستاوە) .

وریا : قوربان ، گەر لەم ئەرکە ببەخشیت زۆر مەمنونت ئەبم .

سەرنووسەر : بۆ ، چی‌تیایە ؟ بە پێچەوانەوە ، چاوپێکەوتن لەگەڵ مامۆستا بەشیر فەتحوڵلای شاعیرو ڕۆماننووسی ناسراو کارێکی زۆر چاکەو کەرەستەیەکی یەکجار جوانیش ئەبێت بۆ گۆڤارەکەمان .

وریا : ئاخر قوربان ، خۆشت ئەزانیت من ئەدیبێکی لاوم‌و تێڕوانینی تایبەتی‌ی خۆم هەیە بەرامبەر بە ئەدەب‌و هەڵوێستی مامۆستا بەشیر کە ناتوانم لێ‌ی بشارمەوە ، کە دەریشم بڕی ئەو پێ‌ی ڕازی نابێت ، پاشانیش من . . .

سەرنووسەر : (قسەکەی پێ‌ئەبڕێت) ئەوە جیایە ، تۆ ئەچیت گفتوگۆی ئەدەبی‌ی لەگەڵدا بکەیت ، خۆ دانانیشیت لە بەرهەمەکانی بکۆڵیتەوە .

وریا : مامۆستا ، تکا ئەکەم ئەم ئەرکە بەمن مەسپێرە .

سەرنووسەر : تکاو مکانی‌یە ، بیانووش مەدۆزەرەوە ، هانێ ئەمە ژمارەی تەلەفونەکەیەتی (لەسەر مێزەکەی دائەنێت) برۆ چاوپێکەوتنەکەی لەگەڵ بکەو وازمان لێ‌بێنە ، دوو کەسی‌ترتان ڕەفزی کرد ، باوکم چی‌یە ، ئێمە چیمان هەیە ؟ گۆڤاری ئەدەبی‌یان گۆڤاری ئاسایشی دەوڵەتان ، برۆو گیروگرفتمان بۆ درووست‌مەکە . .

(سەرنووسەر چاوێلکەکەی لە چاو ئەکات‌و چەند پەرە کاغەزێك ئەگرێت بە دەستەوەو ئەیانخوێنێتەوە ، وریاش بەتێ‌ڕامانەوە ژمارەی تەلەفونەکەی بەشیر لەسەرمێزەکە هەڵ ئەگرێت)

وریا : زۆر چاکە ، مادەم گیروگرفت لە ئارادایە من ئەچم ، مامۆستا بەڵام . .

سەرنووسەر : بەڵام چی ؟

وریا : بەڵام گەر ڕێم بدەیت ، چاوپێکەوتنەکەی بەشێوازی تایبەتی‌ی خۆم لەگەڵدا ئەکەم .

سەرنووسەر : شێوازی تایبەتیت یان شێوازی گشتیت بێ گرنگ نی‌یە ، براکەم ، ڕزگارم کە ، من لێرە هیچ ئیش‌و کارێکم نی‌یە تەنیا ئەوەنەبێ وەڵامی تەلەفون بدەمەوە بۆ مەسەلەی چاوپێکەوتنی . .

وریا : (پێ‌ی ئەبڕێت) تێگەیشتم ، مامۆستا . بەسەرچاو ، خواحافیز . .

(تاریکی)

(پاش مۆسیقایەکی کورت ، ڕوناکی ئەچێتە سەرژووری ڕۆژنامە نووسەکان ، ئەنوەر خەریکی نووسنە . .)

ئەنوەر : (لەبەر خۆیەوە) مەکسیم ، ماکسیم گۆرگی . غورکی ، غورغی ، نەء گۆرکی ، ئا ، گۆرکی ڕووت باشترە . . ئەنیتوان ، ئەنتۆن ، ئەنتۆن چیخۆف ، تشیخۆف .

تشیخەف ، چیکۆف ، چیخەف ، ئەمەیانە . . چیخەف ، ئەنتۆن چیخەف ، زۆرچاکە . . (وریا دێتە ژوورەوە) ، ها وریا گیان ، چی بوو ؟ ڕازیت کرد ؟

وریا : ئەو منی ڕازی کرد ، چونکە بەشیرەکان ئەویان ڕازی کردووە ، کاك ئەنوەر ، بەسەری تۆ ، پێنج ساڵی ڕەبەقە لەم گۆڤارەدا کارئەکەم هێندەی ئەمڕۆ مشتو مڕم لەگەڵ مامۆستادا نەکردووە . . بەهەر حاڵ ، تەلەفونی بۆ ئەکەمو کاتێك دیاری ئەکەین . .

ئەنوەر : دەی خێری پێوەبێت .

وریا : (تەلەفونەکە ئەخاتە بەردەمی و لەگیرفانی پارچەیەك کاغەز دەردێنێ و تیّی ئەڕوانیّ و ژمارەکان با ئەدات) هەلاو ، ئەم کاتەت باش ، جەنابت مامۆستا بەشیر فەتحوڵلایت . . من ڕۆژنامەنووسم لە گۆڤاری . . . بەڵێ . . ئا . . بەڵێ لێرە کار ئەکەم . . چی ؟ . چاوەڕێت ؟ . دەمێکە ؟ . ئێ زۆر چاکە . . بێ زەحمەت ناونیشانەکەت . . بەڵێ هی ماڵەوەتان . . (کاغەزێك ئەخاتەبەر دەمی و قەڵەمەکەی دەردێنیّ) بەڵێ . . (ئەنووسێت) بەڵێ . . شەقامی . . . بەرامبەر . . ژمارە . . ناوەکەت بەسەرقاپێکەوەیە ؟ . زۆر چاکە . . ئەمڕۆ ؟ باشە . . کات ژمێر پێنجی عەسر ، زۆر چاکە . . بەڵێ . . بەڵێ ئەزانم . . خوات لەگەڵ . . سوپاس . . خواحافیز . .

(تەلەفونەکە دائەخاتەوە) ئەڵێ دەمێکە چاوەڕێی ئەم چاوپێکەوتنەم ، بەڵێنیان پیّی داوە . . بەڵام پیاوێکی زمان شیرینە .

ئەنوەر : عەسر ئەچیت ؟

وریا : بەڵێ ، سەعات پێنج .

تاریکی ، مۆسیقایەکی کورت ، ڕوناکی ئەچێتە سەر ژوورەکەی بەشیر ، بەشیر خۆی گۆڕیوەو قاتێکی تازەی ڕەشی لەبەردایە ، وریا تازە گەیشتووەتە ئەویّو دەستی یەکتر ئەگوشن)

وریا : سەعات پێنجی تەواوە . . هیچ دووانەکەوتم .

بەشیر : ئەهلەن . . ئەهلەن ، بەخێربێیت سەر هەردوو چاوم ، فەرموو ، فەرموو . .

وریا : (دائەنیشێت) سوپاست ئەکەم . .

بەشیر : چۆنی ؟ باشیت شکور . . چی یە ؟ ئەڵێی وێنەگرت نەهێناوە ، دیارە چاوپێکەوتنەکە بەبێ وێنە بلاّو ئەکەنەوە . . جا چۆن ئەبێت ؟ !

وریا : ببورە ، ئەوی ڕاستی بێت بیرم چوو وێنەگری گۆڤارەکەمان لەگەڵ خۆمدا بێنم .

بەشیر : ئا . . بەبێ وێنە ! دەی هەر چۆنێك بێت ، گرنگ نی یە ، گوێشی مەدەریّ ، ئەوەندە وێنەمان بلاّوکرایەوەو هیچیشمان لیّیان دەست نەکەوت وێنەی خۆم لەبەر چاو کەوتووە (ئەمە ئەڵێ و پەستی ئەیگرێت ، جگەرەکەی دەستی ئەکوژێنێتەوە) .

وریا : ئەڵێم دەست پیّبکەین (ئامێری تۆمار «تسجیل»یکی بچکۆلەو هەندێك پەڕە کاغەز لەبەر دەمی لەسەر تەپلەکێك دائەنێت) .

بەشیر : بەڵێ باشە ، با دەست پیّبکەین ، بەلاّم من وای بەچاك ئەزانم قسەکانمان تۆمار بکەیتو پاشان بیان نووسیتەوەو دووا جاریش کە پاك نووست کرد پیشانی خۆمی بدەیتەوە ، هەروەها تکایە کەی ئیشارەتم کرد تۆمارەکە ڕابگرە ، ئەزانیت بۆ ؟ چونکە هەندیّ شت هەن نامەوێت بلاّوبکرێنەوە ، خۆت ئەزانیت زەللەی زمانە ، یەك ووشەی زیاد هەزار لێکدانەوەی هەڵە لێکی ئەدەنەوە ، ئالەبەر ئەوانە ئەڵێم . . . ئێستا چا

ئەخۆیت ؟

وریا : ئەگەر ئەرك نابێت . .

بەشیر : وتت وێنەگرەکە کەی دێت ؟

وریا : عەرزم کردیت بیرم چووە پێی بڵێم ، داوای لێبوردن ئەکەم .

بەشیر : قەی ناکات ، دەستکەوت لەوێنە بلاوکردنەوە ئەبێت چی بێت ؟

(ئیشارەت بۆ تۆمارەکە ئەکات و دەنگ بەرز ئەکاتەوە) خۆ نەتکردۆتەوە ، بۆ خاتری‌خوا . . دەی زۆر چاکە (جگەرەیەك دائەگیرسێنێ و نەفەسی قووڵی لێ ئەدات) .

وریا : (تۆمارەکە دائەگیرسێنێ) مامۆستا بەشیر فەتحوڵلا تۆفیق . . .

بەشیر : (پێی ئەبڕێت) بەڵێ .

وریا : تۆ کێیت ؟

بەشیر : (بەخێرایی قاچ ئەخاتە سەر قاچ) من نەتەوەییەکی دڵسۆزم و بە ئەسڵ خەڵکی لادێین ، بەلام دایك و باوکم لەم شارەدا ژیاون و منیان بووە ، لە ساڵەکانی بیستدا لە دایك بووم ، هەر بەوێنەی باوك و دایکم پەژارەم زۆر دیوەو تاڵیم زۆر چەشتووە ، بێ هیچ خۆشی و ئاسوودەیی‌یەك پەروەردە کراوم و بە نەبوونی و نانەسکی گەورە کراوم ، کاتێ خۆی خراومەتە بەر خوێندن و لەگەڵ ژیانی پڕ نەهامەتی و گیروگرفتدا وازم لەقوتابخانە نەهێناوە ، باوکم جوتیاربووە هەروەها باپیریشم و باوکی دایکیشم ، ئێمە خێزانێکی جوتیارین ، هەروەك ئەبینیت ئیلهام لە سروشت و جوانی‌یەکەی وەرئەگرم ، سروشت لای من سەرچاوەیەکی نەمرە .

وریا : لە کوێ تەمەنی منداڵی و مێرد منداڵیت بەسەر بردووە ؟

بەشیر : لە یەکێك لە گەڕەکە کۆنەکانی ئەم شارە ، باوکم چایخانەیەکی بچووکی هەبوو ئیشی لەسەر ئەکرد .

وریا : کەواتە کام سروشتەبوو تۆ لەم گەڕەکەدا دڵت پێی ئەکرایەوە ؟ !

(بەشیر ئیشارەت بۆ ڕاگرتنی تۆمارەکە ئەکات و وریاش ڕای ئەگرێت)

بەشیر : ئەم پرسیارە چی‌بوو ؟

وریا : مامۆستا ، تۆ فەرمووت . .

بەشیر : ئەزانم ، ئەی قسەمان دەربارەی جوتیاران نەکرد ، ئێ سروشتیشی بەندە بەژیانی ئەوانەوە . . من سروشتم دیوە ، تەرەماشم دیوە ؟ ! کاکی خۆم ، واز لەو پرسیارە بهێنە . .

وریا : (پەنجە بە تۆمارەکەدا ئەنێتەوە) مامۆستا بەشیر ، بەبڕاوی تۆ ، دەوروبەر تۆی کرد بەشاعیرو ڕۆمان نووس ، یان شتێك لە ناوەوەی ناخی خۆتدا هەبوو و لەگەڵ دەوروبەرەکەتدا هەڵچوو و بەهرەی تەقاندیتەوە ؟ .

بەشیر : (خۆی ڕاست ئەکاتەوە) لام وایە ئەبێت ئەم پرسیارە گرنگە لەو بەرێزانە بکرێت کەئەرکی ڕەخنەگرتن لە مێژووی ژیانم ئەگرنە ئەستۆی خۆیان ، بەلام من ، تا ئێستا نازانم ، ئایا ژیانی پڕ لە هەژاری و کوێرەوەری بوو یان هەستی ناسك و عاتیفەی خرۆشاوی خۆم بوون تێکەڵ بەواقیعە پڕ ئازارەکە بوون و لە ئەنجامدا هۆنراوەو داستان و ڕۆمانیان لێ لە دایك‌بوو ؟ تا ئەمڕۆ زانستی دەروون ناسی لە ئاستی شتێکدا دۆش داماوە ، ئەو شتەش شی‌کردنەوەو تێگەیشتنە لە بزوتنەوەی داهێنان و ئەفراندنی مرۆڤی داهێنەر .

وریا : مامۆستا ، جەنابت تا ئێستا گەلێك دیوانە شیعرو ڕۆمانت بلاوکردۆتەوە . . .

بەشیر : (پیێ ئەبڕێت) شانزە دیوانەو سیێ ڕۆمانی گەورەو شانۆگەرییەکی شیعریو چەندان چاوپێکەوتنو نووسینو وتار لەگشت ڕۆژنامەو گۆڤارەکانی خۆمانو ولاٰتانی دراوسیێو بێگانەدا .

وریا : ئەم هەموو بەرهەمە هەمە جۆرەت نووسیوە ، پەیوەندیت لەگەلٚ ئەدەبدا چۆنە ؟

بەشیر : پەیوەندیم چۆنە ؟ !

وریا : مەبەستم لەوەیە ، خۆشت ئەویێ ، ڕقت لیێەتی ، ئایا پەشیمان نیت لە بلاٰوکردنەوەی بەرهەمەکانت ؟ یان هەندێکیان . . ئایا . .

بەشیر : (قسەکەی پیێئەبڕێت) پەشیمان بوونەوەی چی ؟ من خزمەتی گەلو نیشتمانەکەم کردووە ، من هەر لەمنداڵیەوە حەزم کردووە گۆرانی بەسەر نیشتمانو سەربەستیو برایەتیدا هەڵبدەم ، ویستوومە بەرگریی لە ئافرەت بکەم ، ئەو ئافرەتەی هەڵسوکەوتی بەرێزەوە لەگەڵدا ئەکەم ، بۆ ژیانو خۆشەویستیو جوانی بەرهەمم نووسیوە ، چۆنڕقم لەم ئەدەبە ئەبێت ؟ ! ! خۆ ڕۆمانەکانم ، بەگەواهیدانی گشت ڕەخنەگرەکان شاکاری بیێوێنەن ، زۆر کەس لەسەریان نووسیونو بڕوانامەی دکتۆراشیان وەرگرتووە ، بەرادەیەك وام کردووە کە بەهۆی ڕۆمانەکانمەوە ئەدەبەکەمان بگاتە کەشکەلاٰنی فەلەك .

(بیێ دەنگئەبێت ، ئیشارەت بۆ ڕاگرتنی تۆمارەکە ئەکات ، وریاش ڕای ئەگرێت) . وشەی کەشکەلاٰنی فەلەك بسرەوە ، تۆزیێ نەوعێکە . . توخوا دەقیقەیەك ، (وریا ئەیگێڕێتەوەو ئەیسڕێتەوەو پاش تاوێك ئیشی پیێئەکاتەوە) . وام کرد ئەدەبەکەمان شان بدات لە شانی ئەدەبیاتی جیهانی مونافەسەی بکات . . لەم خاڵەشەوە بە دڵێکی بریندارەوە پرسیار لە هەڵوێستی فەرمانڕەواکانمان ئەکەم بەرامبەر بە لیژنەی بەخشینی خەلاٰتی نۆبلٚ ، گلەیی ئەوەیان لیێئەکەم بۆ لەوەتیێ ناگەن کە لەلایەن ئەو لیژنەیەوە پشت گویێ خراوین ، بەڕاستی قبوولٚ کردنی ئەوە شوورەیی‌یە !

وریا : مامۆستا بەشیر ، لات وایە کە هەقە خەلاٰتی نۆبلٚ بدرێت بە جەنابتان ؟ !

بەشیر : ئەی هەرچی خوێرییە وەری بگرێتو ئێمەش هیچ (داوای وەستانی تۆمارەکە ئەکاتو وریاش کەمێك ئەیگێڕێتەوەو ئەیخاتەوە کار) ، تۆمارکە ، من ناڵێم مافی خۆمە نۆبلٚ وەربگرم ، بەلاٰم ئەو بایەخەی چ لێرەو چ لەدەرەوە بە دیوانو ڕۆمانەکانم دراوە ، پێویستە مایەی سەرنجدانی ئەو لیژنە نەیارەی نۆبلٚ بێت !

وریا : بۆ لاتوایە خەلاٰتی نۆبلٚ سوودێکی وای هەبێت ؟ !

بەشیر : ئەم قسەیە چی‌یە ؟ ! براکەم ، سەدان هەزار دۆلار گاڵتەیە ؟ ! بیسڕەوە . . بیسڕەوە ، (وریا ئەیسڕێتەوەو دوایی ئەیخاتەوە ئیش) لە ڕاستیدا لەو باوەڕەدام هێندەی کەسانێك گرنگیی پیێئەدەن ئەوە ناهێنێتو ئەوەندە گرنگ نیی‌یە ، بەتایبەت کە تا ئێستا زۆر مەزنە ئەدیبی جیهان پیێیان نەبەخشراوە !

وریا : مامۆستا کەواتە تۆ بڕوات بەوە هەیە ئەگەر خەڵکی نیشتمانەکەت بەرێزەوە ناوت بێنو بەخۆشەویستیی خۆیان بەرزت بکەنەوەو بە پەرۆشەوە بەرهەمەکانت بەسنگەوە بگرن ، زۆر لەو خەلاٰتانە بەنرخترە کە لەپشتی پەردەوە ئەبەخشرێن !

بەشیر : بێگومان ، بێگومان ، لەپشت پەردەوە . . بێگومان . . شەرەفی گەورە بۆ من لەوەدایە کە خۆشەویستیی هاونیشتمانەکانم و ڕێزی بیێپایانی ئەوانم پیێبەبڕێت ، لە خواش بەزیاد بیێ ئەمە هاتۆتەدیو تەنیا ئەمەش بۆ من هەموو شتێکە .

وریا : پەیوەندیت لەگەڵ خوێنەرەکانت‌و ئەوانەی سەرساممیان پێت تا چ ڕادەیەکە ؟
(سەرسامبوون)

بەشیر : پەیوەندی‌یەکی یەکجار توندو تۆڵە .

وریا : بەرهەمی ئەدیبە لاوەکان ئەخوێنیتەوە ؟

بەشیر : وەکو هی کێ ؟

وریا : وەك هی فلانی فلان‌و فلان‌و فلان فلانەیی . .

بەشیر : ئەوانە کێن ؟ !

وریا : ئەدیبی لاون ، شاعیرو چیرۆك‌نووسن .

بەشیر : بەراست ؟ ! (دوای کەمێك وەستان) لە ڕاستی‌و واقیعدا ، من پەیوەندی‌یەکی یەکجار بەهێزم لەگەڵ ئەدەبیاتی نوێ‌ی لاوانی ولاتەکەماندا هەیە ، بەلام هەرگیز ناتوانم بلێم کە هەرچی‌یەك لەوبارەیەوە نووسراوەو بلاوکراوەتەوە دیومن ، ئەمەش ئەنجامی دوو هۆیە :

یەکەم ، ئەدیبە لاوەکان هەموو بەرهەمەکانی خۆیانیانم بۆ نانێرن ، دووەمیش ، سەرقالم بە کاروباری ڕەسمی‌یەوە ، هەروەها بۆ نوێنەرایەتی کردنی ولات گەلێك سەفەری دەرەوە دێنە ڕێم . . بەلێ زۆربەی کاتم بەوانەوە ئەڕوات .

وریا : گەورەم ، ئەم قسەیەت کەمێك سەیر نی‌یە ؟ !

بەشیر : بۆچی سەیرە ؟ ! ! چ خەوشێ لە سەفەرکردندایە ؟ ! بۆ هەموو کەسێك سەفەر ناکات ! .

وریا : (قسەکە بە بەشیر ئەبڕێت) ببورە ، تەنیا مەبەستی من بێ ئاگایت بوو لە بەرهەمی ئەدەبیاتی لاوەکانمان . . . لە شیعرو چیرۆکیان‌و . .

بەشیر : هۆی ئەمەم بە درێژی بۆ باس کردیت ، پێویست ناکات زیاتری لەسەر بڕۆین !

وریا : ببورە مامۆستا ، ئەتوانم ئەمە بە چەشنە بەرهەلستکاری‌یەك ناوبنێم .

بەشیر : (گاڵتەی بە قسەکەی وریا دێت) بەرهەلستکاری ! ! نەخێر ، تکا ئەکەم قسەکانم بەو شێوەیە لێك‌مەدەرەوە . . ڕاستە فەرامۆشی‌یەکی بچووك هەبووە . . .

وریا نەخێر گەورەم ، هەندێ ئەدیب ، کە لەو بڕوایەدانیم تۆش وابیت ، لایان وایە ئەو گەنجانە ئەیانەوێت تەنگیان پێ‌هەلچنن‌و جێگایان پێ لێژکەن‌و شوێنیان بگرنەوە ، وەك ئەوەی مەسەلە . . .

بەشیر : بڕوا ناکەم ، بڕوا ناکەم ، واز لەم باسەش بهێنە ، فەرموو وەرە سەر پرسیارێکی ترت .

وریا : (پاش کەمێك بێ‌دەنگی ، لەبەر خۆیەوە ئەدوێت) ئێستا شێوازی تایبەتیم دەست پێ‌ئەکات ، ئەو شێوازەی بۆ جەنابی سەرنووسەرم باس‌کرد . . (دەنگ بەرزئەکاتەوە) بەر لەوەی بێمە سەر پرسیارێکی‌ترم ، ئایا گوێ لە ئەدیبێکی لاو ئەگرن ؟

بەشیر : بێ‌گومان . . بێ‌گومان . . (بەسەرسوڕماوی‌یەوە) بۆ تۆش ئەدیبیت ؟

وریا : جار جاری چیرۆك ئەنووسم‌و هەندێك وتارو وەرگێڕانیشم هەیە . . کاتی خۆی ، کە یەکەمین کۆمەلە چیرۆکم لە چاپدا دانەیەکم لێ‌ی بەدیاری بۆ ناردن ، دیارە پێتان گەیشتووە ، ئێستاش ئەمەوێ سوود لە ڕای جەنابتان دەربارەی وەربگرم‌و واشم پێ‌خۆشە لە تێبینی‌و ڕێ پیشاندانی بەنرخی بەڕێزتان بێ‌بەش نەبم .

بەشیر : (بەپەلەوە ، هەردوو بالی‌و دەمی‌و چاوەکانی ئەکاتەوە)

بەخوا . . .

وریا : دیارە سەرقالیتان بواری خوێندنەوەی ئەوکتێبەی بۆ نەرەخساندوون ، ئەمەش جێگای داخە . . چونکە هەست‌کردن بە سەر نەکەوتن لە دەروونماندا درووست ئەکات . . بۆ بە بەردەوامی‌ی خۆتانمان نازانن ؟ لاتان نەنگی‌یە

گەورەم ؟ بەڵام من شیعرەکانت‌و هەوڵدانی چیرۆك نووسینی تۆم بەدڵن .

بەشیر : چی ؟ ! هەوڵدان ؟ ! !

وریا : ببورە مامۆستا . چیرۆکە شاکارەکانت . بەڵام با هەردووکمان لەسەر ئەوە رازی بین کە ئەدەبیاتی نەتەوەیەك تاقە ئەدیبێك درووستی ناکات . . جا ئەو ئەدیبە با بلیمەتیش بێت‌و بەرهەمی یەکجار زۆریش بێت . . ئەو ئەدیبە بێ‌مێشکانە نایانەوێ ناوی ئەدیبانی بێ لە خۆیان لە ولاتدا دەرکەون . . بەرای تۆ ئەوانە راستن ؟

بەشیر : نا . . نا . . برام نەء . . هەرگیز ئەوانە راست نین .

وریا : ئەبێ نرخی ئەو ئەدیبە کەللە پووتە چی بێت کاری ئەدیبانی پێش خۆی لەسەر نەبێت‌و سوود لە تاقی کردنەوەی ئەدیبانی سەردەمەکەی خۆشی وەرنەگرێت ؟

بەشیر : کێ ؟ مەبەستت لە کێ‌یە ؟

وریا : بێ‌گومان دوای ئەو ئەدیبە کەسانی‌تر دێنە پێشێ‌و کەرەستەی تازە ئەخەنە سەر بەرهەمەکانی . . ئاوا ، بەوشێوەیە ئەدەبی نەتەوە وەك زنجیرێك وایەو نەوە دوای نەوەش ئەڵقەکانی بەیەکەوە ئەبەستن .

بەشیر : ئەو ئەدیبەی باست کرد خەڵکی کوێ‌یە ، من ئەیناسم ؟

وریا : ناوبردن چ سوودێکی هەیە گەورەم ؟ . .

بەشیر : (بەزەردەخەنەوە) بابەگیان زانیم کێ‌یە ، دۆزیمەوە ، تۆسەری خۆت چاوێلکە ئاڵتوونی‌یە فشەکەرەکە نی‌یە ؟

وریا : گەر رێم بدەن پرسیارێکی‌تر .

بەشیر : فەرموو .

وریا : چۆن کاتی خۆتان لە نێوان کاروباری رەسمی‌و خەریك بوونتان بە ئەدەبەوە رێك ئەخەن ؟

بەشیر : راستێکەی . لەمەدا تووشی ماندوویێتی ئەبم . بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا تا ئێستا توانیومە کاتی خۆم رێك بخەم‌و هەمیشە هەوڵی ئەوەم داوە کە فەرمانەکانم لە نووسینم نەکات . .

وریا : ئەی بۆ مەسەلەی سەربەستیی ناوەوەت ؟

بەشیر : (لە جێی خۆی وشك ئەبێ‌و وەك ئەوەی گوێی لە وریا نەبووبێ) بەڵێ ؟

وریا : تۆ سەربەستیت لە هە ڵبژاردنی بابەتی نووسینەکانتاو بلاوکردنەوەیاندا ؟

بەشیر : مەبەستی تەواوت لەم پرسیارە چی‌یە ؟

وریا : بەر لەدەست کردن بە نووسینی بەرهەمە داهێنەرەکانت ، هەست بەوە ئەکەیت ، یان بابڵێم لە حاڵێکی دەروونی وادایت . . مەبەستم لەوەیە ئایا لە ناخی خۆتدا لەوە دڵنیایت گەر بتەوێ بفریت ، ئەتوانیت ؟ چونکە لەو کاتەدا هەست ئەکەیت خاوەنی جووتێ باڵی وەهایت کە لە باڵندە زیاتر سەربەستیی فرینت هەبێت . . واتە . . نازانم لە مەبەستەکەم تێ‌گەیشتیت ؟

بەشیر : بێ‌گومان،بێ‌گومان،بۆ تێ ناگەم ؟ ! هاورێی لاوم ، گوێ‌بگرە ، من هەرکاتێك مەیلم لە نووسین بێت ئەنووسم ، هەرکاتێکیش بمەوێت بەرهەمم بلاوئەکەمەوە ، لەم رووەوە هیچ جۆرە گیروگرفتێکم نی‌یە .

وریا : کەواتە تۆ سەرفرازیت .

بەشیر : ئەتوانم بڵێم سەرفرازم ، هەرچەندە هەندێك کەلەبەر لە ناخمدان .

وریا : لە رووی دارایی‌یەوەش باشیت ، وانی‌یە ؟

بەشیر : بەڵێ زۆر زۆر باشم ، (چاوی ئەقووچێنێ) مەبەستت لەمە چی‌یە ؟

وریا : هیچ گەورەم . . ئەوە نەبێت . . . گەر بفەرموویت

مەسەلەیەکت بۆ باس بکەم . زۆر ئەدیبی لاو هەن لە مانگێکدا توانای کرینی کتێبێك زیاتریان نی یە ، ئەوەش دوای ئەوەی لە دەمی خۆیان ئەگرنەوە . .

بەشیر : خوا یارمەتی یان بدات .

وریا هەندێکیان تەنانەت جلو بەرگی تەواوشك نابەن . . ئەمە رەوایە ؟

بەشیر : کامە ؟

وریا : ئایا ئەمە جیاوازیی ئابوری نی یە لە نێو ئەدیباندا ؟ هەقە وابێت ؟

بەشیر : (دەست بەرز ئەکاتەوە) تکایە تۆمارەکە راگرە . . (وریا رای ئەگرێ) .

چی یە ، کاکە ؟ تۆ هاتووی چاوپێکەوتنی ئەدەبیم لەگەڵدا بکەیت یان رۆحم بکێشیت ؟ من هەقم بەسەر ئەوانەوە چی یە ؟ پاشان ، لە هەموو جێگایەك ئەوانە هەر هەنو جیاوازیی مادیی هەرهەبووە ! .

وریا : ببورە مامۆستا ، تکایە ببورە ، من حەزم کرد تەنیا ئاماژە بۆ چەند حاڵەتو دیاردەیەك بکەم ، ویستم بڵێم : ئێوە گەر بتانەوێ بەهۆی پلەی رەسمیو باری ئابووریتانەوە ئەتوانن یارمەتیی چارکردنی ئەو گیروگرفتانە بدەن .

بەشیر : چۆن چۆنی ؟

وریا : بەبەخشینی پاداشتی چاك بە ئەدیبە لاوەکانو گرنگی دان پی یان ، گرنگی دانی بێ جیاوازی .

بەشیر : ئەمە ماقووڵە . . زۆر ماقووڵە . . بەڵام ئەو جیاوازی یە چی یە باست کرد ؟

وریا : نازانم ، مامۆستا ، هیچ نی یە .

بەشیر : (بە پەنجە ئاماژە بۆ کردنەوەی تۆمارەکە ئەکات) فەرموو ، من ئامادەم .

وریا : (ئەیکاتەوە) سوپاس ، فەرموون .

بەشیر : بە ئەدیبە لاوەکان رابگەیێنە ، من هەمیشە لە گەڵیاندامو بەهەموو توانایەکمەوە یارمەتی یان ئەدەم . . لەگشت رووێکەوە ، بەبێ جیاوازیش .

وریا : سوپاس ، مامۆستا ئەمە هەڵوێستێکی شەرەفمەندانەیە گەر بفەرموویت پرسیارێکی ترم هەیە . .

بەشیر : (تێروانینێکی سەیر ئەروانێتە وریا) پرسیارێکی تر ؟ ! راستێکەی ئیشێکی گرنگم هەیەو بیرم چووبوو . . بەهەر حاڵ ، فەرموو ، کورم پرسیارەکەت چی یە ؟

وریا : گەورەم ئێوە لە چەند گۆڤارو رۆژنامەیەکی دەرەوەی وڵاتدا ئەنووسن ، ئەوانەش لەم ساڵانەی دواییدا دامەزراون .

بەشیر : بەڵێ ، وایە .

وریا : رێبازی ئەو گۆڤارو رۆژنامانەش وایە کە مەسەلەکان زۆر بە رووکەشو ساکاریی دەربڕن .

بەشیر : ئەمە پەیوەندیی بە خۆیانەوە هەیە . . .

وریا : ئەوان خۆیان لەمەسەلە فیکری یەکان بە دوور ئەگرنو هانی نووسینی کاڵو کرچو بێسوود ئەدەنو بەردەوام شبت بۆ ئەو نووسەرانە بلاوئەکەنەوە کە بەرهەمیان وا لە ئاستی بەرهەمی لاوازی سەردەمە تاریكو نووتەکەکانی ئەدەبەکەدا . .

(بەشیر بە چاوی پڕ لەرقەوە ئەروانێتە وریاو خۆی بە کتێبێکی بەردەستی یەوە خەریك ئەکات) . .

بەشیر : ئی ی . .

وریا : چۆن ئەبێت ناوی دیارو ناسراوی ئێوە لە پاڵ ئەو ناوە گومراو لاوازانەدا دەرکەوێت ؟ ئایا ئەمە لە خۆیدا پشت گرتنی بەرهەمی سادەو خراپ نی یە ؟

بەشیر : من بە سەربەستیی تەواوەوە بیروڕای تایبەتیی خۆم بلاوئەکەمەوە ، ئیتر خەڵکی تر بە جەهەننەم . . ئەوەی لای من گرنگە دەربڕینی ئاشکرای رای خۆمە ، ئەوە هەموو شتێکەو برایەوە .

وریا : یانی هیچ هۆیەکی تر نی یە ؟

بەشیر : مەبەستت چی‌یە ؟

وریا : هیچ . من تەنیا پرسیار ئەکەم !

(بەشیر رووی لیٚوەرئەگێرێ . چاوپێکەوتنەکە کۆتایی پیٚ دێنیٚ ، وریاش تۆمارەکە دائەخات‌و پارچە کاغەزەکانی کۆئەکاتەوە هەلٚئەستیٚ . بەشیر هەلٚئەستیٚ‌و بەرەو دەرگای ژوورەکە پێشی ئەکەوێت . لە ناو دەرگاکەدا زۆر بەساردی‌یەوە دەستی وریا ئەگوشیٚ) .

بەشیر : وتت ناوت چی‌یە ؟

وریا : وریا ، وریا محەمەد .

بەشیر : بەر لە بلاٚوکردنەوەی ئەم چاوپێکەوتنە ، ئەمەویٚ ببینمەوە .

وریا : بیٚگومان ، بیٚگومان ، بەسەرچاو ، مامۆستای بەریٚز ، زۆر سوپاست ئەکەم . . مالٚ ئاوا . .

بەشیر : خوا حافیز .

(وریا ئەڕوات‌و تاریکی ، لەگەلٚ مۆسیقایەکی کورتدا ڕوناکی ئەچێتە سەر ژووری ڕۆژنامەنووسەکان)

ئەنوەر : ئیٚ ، کاکەوریا ، دوایی ؟

وریا : دوایی کۆتایی بە چاوپێکەوتنەکە هێناو چوومە دەریٚ ، ئەڕۆیشتم‌و هەستم ئەکرد کارێکی گەورەم بە ئەنجام گەیاندووە ، دەرەوەی مالٚەکەی بەشیر فەتحوللاٚو شەقامەکان زۆر خۆش‌و دلٚگیر بوون ، هەواکە پاك‌و بیٚگەرد بوو . پڕ بەسنگم لێم هەلٚمژی ، بیرم کەوتەوە وا ئێوارەیەکی درەنگە‌و هێشتا چام نەخواردۆتەوە ، خەمیشم لیٚهات ، چونکە ڕێگای مالٚەکەمان زۆری بەبەرەوە مابوو ، دوێنیٚ شەو ماوەیەکی باش بە پاکنووس کردنی چاوپێکەوتنەکەوە خەریك بووم ، ئەم بەیانی‌یەش زوو دامە سەرنووسەرو وا چاوەڕیٚی وەلاٚمی ئەو ئەکەم‌و باقی وەلسەلام .

ئەنوەر : دەستت خۆش ، چۆنت ویست وات بە ئەنجام گەیاند ، هەر خوا بکات (زەنگی تەلەفونەکە لیٚئەدات) هەر خوا بکات ڕازی بێت بە بلاٚوکردنەوەی . . (ئەنوەر تەلەفونەکە هەلٚئەگرێت) سەرچاو کاك بەشیر . . ببورە . ببورە مامۆستا . بەلٚیٚ لێرەیە ، فەرموو مامۆستا . لەگەلٚتایە . فەرموو . . (بەوریا ، بە هێواشی) سەرنووسەرە . .

وریا : (تەلەفونەکە ئەنیٚ بەگویٚیەوە) بەلٚیٚ . سوپاست ئەکەم . . بەلٚیٚ ، بەلٚیٚ ، ئەی چۆن قوربان . بڕوا بکە ئەمشەو نەخەوتم تا لە پاکنووسی بوومەوە . بەلٚیٚ . . چۆن ؟ بۆچی ؟ کەی . . باشە دێمە خزمەتت . . خوات لەگەلٚ بێت . (تەلەفونەکە دائەخات) .

ئەنوەر : دیارە بلاٚوی ناکاتەوە ، نەموت ! .

وریا : ئەلٚیٚ سەعاتێکی‌تر وەرە خوارەوە بۆ لام . موناقەشەی ئەکەین ، چونکە زۆر شتی تیایە پێویستی بە دەستکاری‌و لیٚلاٚبردنە . .

ئەنوەر : دەفەرموو ، چاوت لیٚیە !

وریا : منیش پیٚی ئەلٚێم : بەگۆڕینی وشەیەك چاوپێکەوتنەکە ئەشێوێت ، لەبەرئەوە بە هیچ جۆرێك دەستکاریی ناکەم ، چش ، با ئەم چاوپێکەوتنە بلاٚونەکرێتەوە .

(تاریکی ، لەگەلٚ دەنگی مۆسیقادا شانۆگەری‌یەکە کۆتایی دێت) .

* * *

**تێبینی :**

سەرچاوەی ئامادەکردنی ئەم شانۆگەری‌یە :

گۆڤاری (الأديب المعاصر) . ژمارە ٢٨ . حوزەیرانی ١٩٨٥ . ل ٣٦-٤٣ . چیرۆکی مقابلة لم تنشر)ی مامۆستا (فؤاد التكرلي) .

له ئاسۆی هونەری جیهانی‌دا .

## ریالیزمی تازه یان ریالیزمی کۆمەلأیەتی له نیگارەکانی نیگارکێشی هونەری دیواری‌ی مەکسیکی مەزن :

# «سکیرۆس» دا

نووسینی مێژوو نووسی سۆڤیەت : ن . برۆدسکایا

وەرگێرانو ئامادەکردنی لەرووسی‌یەوە : محمد عارف

له بێنالی هونەری‌ی ڤینیسیا سالّی ۱۹٥۰ ، هونەرمەندی فەرەنسی (هێنری ماتیس) خەلأتی یەکەمی وەرگرت ، خەلأتی دووەم بۆ یەکەم جار له مێژووی ئەم بێنالی‌یە هونەری‌یەدا که له ئاستێکی جیهانی‌دا بەسترابوو ، هونەرمەندێك وەری گرت خەلّکی ئەوروپا نەبوو ، ئەوەیش هونەرمەندی مەکسیکی بەناوبانگ : (داڤید ئەلفارۆ سکیرۆس) بوو . هونەری مەکسیکی هاودەم سەرچاوەکانی له مێژوو و ژیانی کۆمەلأیەتی بەتایبەتی له شۆرشی مەکسیکی که له سەرەتای ئەم سەدەیەمان بەرپابوو ، وەرگرتووە . جۆری دەربرینی هونەری‌ی هونەرمەندانی مەکسیکی بە : (ریالیزمی تازه یاخود بە ریالیزمی کۆمەلأیەتی) ناسراوەو بووەتە جیّی سەرسورمانی بینەرانی بێنالی‌یە جیهانی‌یەکانو سەیرکەرو هونەرمەندان ، لەبەر راستگۆیی دەربرینو شێوازی ئاشکراو گفتگۆ کردنی لەگەلّ هەموو چینەکانی کۆمەلّ .

هونەری مەکسیکی هاودەم قەلأی بەرزی خۆی لەسەر بناغەیەکی نەتەوایەتی (مەکسیکی - ئەسپانی) درووست کردووەو سوودیشی له هونەری مەزنی رینیسانس : (سەدەی ووریا بوونەوە) وەرگرتووە .

(سیّ هونەرمەندە بلیمەتەکان) واتە : (ریڤیرا ، ئەرۆسکۆ و سکیرۆس) توانیویانە لەماووەی نیو سەدەدا قوتابخانەی هونەری‌ی هەرە بەناوبانگی هونەری دیواری‌ی : - MURAL) (ARTی مەکسیکی درووست بکەن ، ئەم قوتابخانەیە شۆرشێکی هونەری‌ی بوو کە هونەری سالّۆنی و بینا داخراوەکان رزگار کردو بەتەکنیکێکی بەرزو بەرگر له گۆرەپانو جادەو شەقامەکاندا هەمان هونەری بۆ گەل پێشکەش کرد ، فەلسەفەی ئیستاتیکی ریالیزمی کۆمەلأیەتی ئەوەیە : له جیاتی خەلّك بچن بۆ بینینی هونەر ، هونەر بۆ خۆی بۆ خەلّك دیّ ، پێشوازی هەزاران بینەران دەکات و هەستی جوان و مرۆڤایەتیان پیّ‌دەبەخشیّ . سکیرۆس دەلّیّ : «پێویستە هونەر رۆلّێکی کۆمەلأیەتی مەزنی هەبیّ ، کارێکی قوولو باش له بینەران بکات ، بێتە مامۆستایان ، سروشیان پیّ ببەخشیّو هیوای دامرکاویان بژێنیتەوەو بەرەو ئاسۆیێکی رۆشەن دەستیان بگریّ .» .

خۆسیّ ئەلفارۆ سکیرۆس[1] له شاری (چیو ئاوا)ی مەکسیکی له سالّی ۱۸۹٦دا له دایك بووە . هەر له منداڵی‌یەوە یەتیم بووەو ژیان وای لیّ‌کردووە بە تاق تەنها بەرەنگاری تەنگو چەلّەمەکانی ژیان بێتو پالّەوانانە بەسەریاندا زالّ بیّ . هونەرمەند له ئەکادیمی‌یەی هونەرە جوانەکانی (سانکارلۆس) خوێندوویەتی‌و له هەمان کاتدا رووی له ژیانی سیاسی‌کردووەو بووەتە ئەندامی لەشکری شۆرشگێری مەکسیکی و لەم رێگایەوە بووەتە لێپرسراوی جەنگی



سیکرۆس . مردن بۆ داگیرکەرانە ١٩٤١- ١٩٤٢

بالیۆزەخانەی مەکسیکی لە مەدرید بەڵام لەئەنجامی ووتارێك دا دوور خراوەتەوەو ڕووی لە ئەوروپا کردوە . ئەم دەربەدەری‌یەی هونەرمەند سوودێکی زۆری دەبێ ، چونکە دەکەوێتە ناوجەرگەی گۆرەپانی فراوانی جموجۆڵی هونەری بەتایبەتی لە ئیتالیاو فەرەنسا . لەم ووڵاتەدا ئاشنایەتی لەگەڵ هونەرمەندی مەکسیکی بەناوبانگ (ریڤیرا) پەیدا دەکات و لە ساڵی ١٩٢٢دا دەگەڕێتەوە نیشتمان و دەست بەبەرهەمی تازە دەکات . لەم قۆناغەدا سەرەتای ڕێبازی هونەری دەست

نیشان دەکری و سوود لە فۆلکلۆری سیمفۆڵی کۆنی مەکسیکی وەردەگری وەك سیمفۆڵی : ئاگر ، خاك ، ئاو و هەوا بەداخەوە ماوەی هونەرمەند نادەن و ناچاری دەکەن واز لە پرۆژە مەزنانە بهێنی و لە ساڵی ١٩٣٢دا بە ناچاری بەرەو ئەمریکا دەڕواو لە شاری (لۆس ئەنژلوس) دەست بەچە فریسکۆیەکی قەوارە مەزن دەکات : (٣٠×٩م) . پاش ئەوە قۆناغێکی زۆر چاك دەبڕێ ، کاربەدەستان نایەڵن تەواو بکات و تاوانباری دەکەن کە مەبەستی هونەرمەند دژ



سیکرۆس . ئەمرۆ ئێمە وەهاین . ١٩٤٧

ئیمپریالیزمە و ئیتر ناچار دەبێ بەرەو کالیفۆرنیاو مۆنتیڤیدیۆ و بۆنس ئایریس بڕوا و تەنیا لە ساڵی ١٩٢٥دا ڕێی دەدرێ بگەڕێتەوە مەکسیك .

هونەرمەندی مەزن لەم قۆناغە تازەیەیدا نیگاری قەوارە بچووکی درووست کردووەو جاری واش هەبووە مۆنتاجی فۆتۆگرافی بەکارهێناوە ، بەتایبەتی لەم نیگارانەی کە مۆرکی دەکومێنتی هەبووەو دژی ئیمپریالیزم بووەو تراژیدیای جەنگی دەربڕیوە وەك (تەقینەوەیەك لە شاردا) و (دەنگ دانەوەی گریان) . هونەرمەند پاش تەواو کردنی نیگارێکی مەزنی دیواریی بە ناوی : (پۆرترێتی بۆرژوازی) لە وولات دوورخراوەتەوە و ئەمجارە بەرەو شیلی چووە . بەرهەمی چڵو پەنجاکانی هونەرمەند شێوەو جۆرە تەکنیك‌و زانستی سەیرکردن واتە (پەرسپەکتیف)ێکی بەکار هێناوە کە بینەر سەیریان دەکات هەموولایەکی بە فیگورات گیراوە ، تەنانەت ساپیتەو سووچی دیوارەکانیش هەموویان بەفریسکۆ رازاندراونەتەوە . باشترین نموونەی بەرهەمی هونەرمەند پاش گەڕانەوەی بۆ نیشتمان زنجیرە



سیکرۆس . بەشێك لە فریسکۆی باری کۆمەڵایەتی ١٩٥٢ - ١٩٥٤ .

فریسکۆی وەزارەتی ئابووری مەکسیکی یە وەك (کۆنە پەرستیو کۆنەپەرستەکان)و (مردن بۆ داگیرکەرەکانە) کە قەوارەیان دەگاتە (٣٦٠م٢) . هونەرمەند لە ساڵی ١٩٤٥دا فریسکۆی سیٚ قۆڵی : (دیموکرایەتی تازە) لە کۆشکی هونەر لە (مێخیکو) دروست کردووە . سکیرۆس هەڵوێستی مرۆڤایەتی و ئاشتی خوزایی دژ بە جەنگی جیهانی دووەم لە نیگاری بەناوبانگی : (ئەمرۆ ئێمە وەهاین) دەربڕیوە نیگاری ناو براو بریتیە لە پۆرترێتی مرۆڤێك کە لە جیاتی سەری مرۆڤەکە بەردێکی درووست کردوە . هونەرمەند پاش پیشانگای گشتی ساڵی ١٩٤٧ کۆمەڵێك لە هونەرمەندانو رۆشنبیران داوای لیٚ دەکەن کە پۆرترێتیان بۆ درووست بکات . سکیرۆس جموجۆڵێکی تایبەتی لە پەنجاکاندا پێشکەش دەکاتو دەست بە زنجیرە فریسکۆی نەخۆشخانەی : (دیٚ لیاراسا)و (شاری زانگۆ)ی پایتەخت دەکات کە قەوارەیان نزیکەی ٣٠٠م٢ زیاترە . پاش ئەوە دیوارەکانی (سەنتەری پزیشکی) بە کۆمەڵە نیگارێك دەرازێنیتەوەو لە دواییدا بانگ دەکریٚ بۆ درووست کردن چەند نیگارێك لە : (یەکێتی نەتەوایەتی ئەکتەرەکان) . بەلاٚ پاش تەواو کردنی لیٚپرسراوەکان رایان لیٚنەبوەو بووە ناخۆشیو لە ئەنجامدا نیگارەکانیان بە پەردە داپۆشتوە . لە سا ١٩٦١دا کە تەمەنی هونەرمەند گەیشتوەتە ٦٥ ساڵ بە تاوانێکی دوور لە راستی ، هەشت ساڵ حوکمدراوە . بەڵام لە ئەنجام پرۆتێستێکی جیهانی ، کاربەدەستانی میری ناچار بوونە بەر بدەن . هونەرمەند پەرتووکێکی نایابی داناوە کە ناز ناوی (چۆن نیگاری دیواری درووست دەکەی) هەڵگرتووە تاقیکردنەوە بەنرخەکانی هونەری خۆی نووسیوەتەوە . پەرتووکەدا هونەرمەند دەڵیٚ : « من عەودالی شێوازێک ریالیزمی تازەم ، کەدەربڕینی کۆنو نویٚ کۆ بکاتەوە ، تەنانە کەسایەتیو شتی مودێرنیو دەروونیش لە ئامێز بگریٚو لە ئا ئەوە بیٚ - مرۆڤایەتی تازە - بەرجەستە بکات . » .

هونەری نەمری سکیرۆسی مەزنو پەرتووکە نایابەک گەورەترین قوتابخانەی هونەری ریالیزمی تازەی مەکسیک جیهانی لە سەدەی بیستەم درووست کردووە .

(١) خوسیٚ لە پاشان ناوی خۆی گۆڕیوە بووەتە (داڤید

– بێنالی : فیستیڤالێکی هونەری جیهانیە هەردوو ساڵ جاریٚ لە وولاتێکـ دە

ترێنالی : هەر سیٚ ساڵ کەرەتێکە .



# گرنگی خواردنی سەوزە لە لایەن مرۆڤەوە

دکتۆر کریم صالح عبدول
کۆلیجی کشتوکاڵ
زانکۆی سەلاحەدین

سەوزە بەسەرچاوەیەکی گرنگی خواردن ئەژمێرریٚ چونکە زۆر ڤیتامینی تێدایە ، هەروەها گەلیٚ لە کانزای تێدایە کە پێویستن بۆ لەش‌و هەندێکیان زۆر باشن لە رێژەی پرۆتینات‌و کاربۆهیدرات . هەر لەبەر ئەمەیە هەندیٚ زانایان ووتوویانە (رووبکەرە سەوزەو میوە پێش ئەوەی روو بکەیتە پزیشك) . واتە زۆر سەوزەو میوە بخۆ بۆ ئەوەی بری پێویست لە ڤیتامینەکان‌و کانزاکان‌و کاربۆهێدرات‌و پرۆتینت وەربگری ، تاکو بەرگرییەکی باشت هەبیٚ لە زۆر نەخۆشی‌و هەموو کارە زیندە چالاکیەکانی لەش بە شێوەیەکی سروشتی روو بدەن بیٚ‌کەم‌و کورتی .

لەم باسەدا بەکورتی باسی ڤیتامینە گرنگەکان ئەکەین کە لەسەوزەدا هەن‌و کاری هەر یەکیان لە پاراستن‌و تەندروستی مرۆڤ باس ئەکەین . هەروەها باسی ئەو رەگەزە کانزایی‌یانە ئەکەین کە لە سوزەدا هەیە ، لەگەڵ پرۆتین‌و کاربۆهیدرات .

١ – **ڤیتامینەکان** :–

ئەمانە چەند پێکهاتوویەکی ئەندامین کە کاری گەورە ئەبینن لە پاراستنی تەندروستی مرۆڤ‌و کارئەکەنە نشونماکردنی لەشی مرۆڤ وە زیندەچالاکیەکانی لەش رێك ئەخەن وە جۆرەکانی بریتین لە :–

أ – ڤیتامین (A)

ئەم ڤیتامینە بۆ کردنەوەی ئارەزووی مرۆڤ بۆ خواردن وەهەروەها هەرس کردنی خواردەمەنی رێك ئەخات وە بەرگری دەداتە لەش دژی گەلیٚ نەخۆشی . ئەم ڤیتامینە



بەشێوەی (کارۆتین) لە رووەکدا هەیە کە ئەگۆرێ بۆ ڤیتامین (A) پاش خواردنی لەلایەن مرۆڤەوە لە ڕێگەی جگەرەوە . ئەم جۆرە ڤیتامینە زۆرە لەگەلاو لقو پۆپو رەگو بەرووبومی گەلێك رووەك وەبەشێوەیەکی سەرەکی لە گێزەری زەردو سپێناخ وە زۆر سەوزەی ترکە گەلاکانی ئەخورێ وەکو لەهانەو کاهوو وەکەرەوزوو سلق وەبەرێژەیەکی کەمتر لەپیازو گێزەری سپیو چلیکدا (شلیك) .

ب – ڤیتامین (B) .

ئەم ڤیتامینە پیێ ئەوترێ (Thiamin) وەکارێکی گەورە دەکاتە سەر ڕێكخستنیی گەلێ لەکارە فیزیۆلۆجیەکانی لەشی مرۆڤ وەمرۆڤێك کە قورسایی ۷۰ کیلۆگرام بێت پێویستی بە یەك ملیگرام هەیە لەم ڤیتامینە لەهەر رۆژێکدا . وەپێویستی بۆ زیاد ئەبێ لەلایەن مرۆڤێکەوە کە هێزی ماسولکەکانی زۆر بەکار بێنی واتە لە لایەن مرۆڤێك کە زۆر ماندووبێت لە ئیشی رۆژانەیدا . وە ئەم ڤیتامینە زۆرە لە فاسۆلیاو بەزالیایو تەڕ وە بە ڕێژەیەکی کەمتر هەیە لە چلیكو خەرشوفو بەقدەنوس .

ج – ڤیتامین (B2)

ئەم ڤیتامینە پیێ ئەوترێ ، Rbboflavin وەکاری زۆری هەیە لە ئۆکساندنو لێ کردنەوە لەلەشی مرۆڤدا وە زۆرە لە تۆوی فاسۆلیاو بەزالیای ووشكو تەڕ وە بە ڕێژەیەکی کەمتر لە پەتاتەو پیازو سێوی بن ئەرزدا هەیە وە مرۆڤێکی ئاسایی پێویستی بە ۱٫۸ ملیگرام هەیە لەم ڤیتامینە لە رۆژێکدا .

د – ڤیتامین (C)

Ascorbic acid

ئەم ڤیتامینە پیێ ئەوترێ ( Ascorbicacid ) پێویستە بۆ مرۆڤ وەکاری زۆرە وەیارمەتی دەرە بۆ دروست بونی ئێسقان وەکار دەکاتە سەر چالاکی سورانەوەی خوێن لەلەشدا ئەم ڤیتامینە زۆرە لە تەماتەو ئاروو وەبیبەر وەچەند سەوزەیەکی ترکە گەلاکانیان ئەخورێن .

گرنگی خۆراکی بۆ هەر ١٠٠ گرام لەو بەشەی کە باشە بۆ خواردن لە سەوزە

| جۆری سەوزە | شێ ٪ | کالۆری | پرۆتین گرام | چەوری گرام | کاربۆهیدرات گرام | کالیسیۆم ملیگرام | فۆسفۆر ملیگرام | ئاسن ملیگرام | ڤیتامین A یەکەی جیهانی | ڤیتامین B1 ملیگرام | ڤیتامین B2 ملیگرام | ڤیتامین C ملیگرام |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| سپێناخ | ٩٣ | ٢٠ | ٢ | — | ٣ | ٨١ | ٥٥ | ٣ | ٩٤٢٠ | ٠/١١ | ٠/٢٠ | ٥٩ |
| بروکولی | ٩٠ | ٢٩ | ٣ | — | ٦ | ١٣٠ | ٧٦ | ١ | ٣٥٠٠ | ٠/١٠ | ٠/٢١ | ١١٨ |
| بزالیای سەوز | ٧٤ | ٩٨ | ٧ | — | ١٨ | ٢٢ | ١٢٢ | ٢ | ٦٨٠ | ٠/٣٤ | ٠/١٦ | ٢٦ |
| پیازی گەییو | ٨٨ | ٤٥ | ١ | — | ١٠ | ٣٢ | ٤٤ | — | ٥٠ | ٠/٠٢ | ٠/٠٤ | ٩ |
| سێوی بن ئەرز | ٦٩ | ١٢٢ | ٢ | ١ | ٢٨ | ٣٠ | ٤٩ | ١ | ٧٧٠٠ | ٠/٠٩ | ٠/٠٥ | ٢٢ |
| پەتاتە | ٧٨ | ٨٣ | ٢ | — | ١٩ | ١١ | ٥٦ | ١ | ٢٠ | ٠/١١ | ٠/٠٤ | ١٧ |
| شووتی | ٩٢ | ٢٨ | ١ | — | ٧ | ٧ | ١٢ | — | ٥٩٠ | ٠/٠٥ | ٠/٠٥ | ٦ |
| چەوەندەر | ٨٨ | ٤٢ | ٢ | — | ١٠ | ٢٧ | ٤٢ | ١ | ٢٠ | ٠/٠٢ | ٠/٠٥ | ١٠ |
| گێزەر | ٨٢ | ٤٢ | ١ | — | ٩ | ٣٩ | ٣٧ | ١ | ١٢٠٠٠ | ٠/٠٦ | ٠/٠٦ | — |
| کاهو | ٩٥ | ١٥ | ١ | — | ٣ | ٢٢ | ٢٥ | ١ | ٥٤٠ | ٠/٠٤ | ٠/٠٨ | ٨ |
| کاروو | ٩٦ | ١٢ | ١ | — | ٣ | ١٠ | ٢١ | — | — | ٠/٠٣ | ٠/٠٤ | ٨ |
| تەماتە | ٩٤ | ٢٠ | ١ | — | ٤ | ١١ | ٢٧ | ١ | ١١٠٠ | ٠/٠٦ | ٠/٠٤ | ٢٣ |
| فاسۆلیای تەڕ | ٨٩ | ٣٥ | ٢ | — | ٨ | ٦٥ | ٤٤ | ١ | ٦٣٠ | ٠/٠٨ | ٠/١١ | ١٩ |
| تووری سوور | ٩٤ | ٢٠ | ١ | — | ٤ | ٢٧ | ٣١ | ١ | ٣٠ | ٠/٠٣ | ٠/٠٢ | ٢٤ |
| بیبەری تەڕ | ٩٢ | ٢٥ | ١ | — | ٦ | ١١ | ٢٥ | — | ٦٣٠ | ٠/٠٤ | ٠/٠٧ | ١٢٠ |
| کاڵەک | ٩٤ | ٢٠ | ١ | — | ٥ | ١٧ | ١٦ | — | ٣٤٢٠ | ٠/٠٥ | ٠/٠٤ | ٣٣ |
| کولەکە | ٨٩ | ٣٨ | ٢ | — | ٩ | ١٩ | ٢٨ | ١ | ٤٩٥٠ | ٠/٠٥ | ٠/١٢ | ٨ |
| کەرەوز | ٩٤ | ١٨ | ١ | — | ٤ | ٥٠ | ٤٠ | ١ | — | ٠/٠٥ | ٠/٠٤ | ٧ |
| لەهانە | ٩٤ | ١٤ | ١ | — | ٢ | ٤٣ | ٤١ | ١ | ٢٦٠ | ٠/٠٣ | ٠/٠٤ | ٣١ |
| هلیون | ٩٢ | ٢١ | ٢ | — | ٤ | ٢١ | ٦٢ | ١ | ١٠٠٠ | ٠/١٦ | ٠/١٩ | ٣٣ |
| شیر | ٨٧ | ٦٨ | ٤ | ٤ | ٥ | ١١٨ | ٩٣ | — | ١٦٠ | ٠/٠٤ | ٠/١٧ | — |
| گۆشت | ٦٩ | ١٨٢ | ٢٠ | ١١ | — | ١١ | ١٨٠ | ٣ | — | ٠/٠٨ | ٠/١٧ | — |

## ٢ – كانزاكان

کانزاکان دەور ئەبینن لەکارە زیندەگی یەکان لەلەشی مرۆڤ وەکانزا هەرە گرنگەکان بۆ مرۆڤ ئەمانەن :–

أ – کالیسیۆم :

بەشداری ئەکات لە دروست بوونی ئیسقانو ددان وە زۆرە لە گەلاّکانی لەهانەو کاهوو و سپیناخ وەبرێکی زۆر کالیسیۆم هەیە لە گەلاّکانی دەرەوە بەهۆی تیشکی رۆژەوە کە باش ئەیان گاتیّ .

ب – فۆسفۆر

بەرێژەیەکی زۆر بەشداری ئەکا لە درووست بوونی ئیسقانو ددان وەگرنگی هەیە لە دارێژانی کالیسیۆم لەم شوێنانەوە زۆرە لەسەوزەی بەزالیای ووشكو تەڕ وەهەروەها لە بەقدەنوسو خەرشوفدا هەیە .

ج – پۆتاسیۆم

ئەمە رێژەی ترشی لەلەشی مرۆڤ رێك ئەخات وە کار ئەکاتە گۆرینی خواردەمەنی کاربۆهیّدرات لەلەشی وە ئەم رەگەزە کانزایی یە زۆرە لە پەتاتەو بەزالیای وشكوە بە رێژەی کەمتر لە شوتیو پیازو ئاروودا هەیە .

د – ئاسن

لە زۆر بەش لەبەشەکانی لەشی مرۆڤ هەیە وە بەتایبەتی لە هیمۆگلۆبینی خوێن وەئەمە پیویستە بۆ نشونماکردنی مرۆڤ وە زۆرە لەگەلاّکانی سلّقو سپیناخ وەتۆوی زۆر سەوزە

## ٣ – پرۆتینەکان

ئەمانە چەند پێکهاتویەکی کیمیاوی ئەندامین نایترۆجینن وەپێك دێت لە کاربۆنو ئۆکسجینو هایدرۆجینو نایترۆجین وەهەروەها چەند رەگەزێکی کیمیاوی تر بەشداری پێك هاتنی پرۆتینەکان ئەکات وەکو کبریت (گۆگرد)و ئاسنو فۆسفور وەئەمانە زۆر پێویستن بۆ گەشەکردنی لەشی مرۆڤ وە بەرێژەیەکی باش هەن لەو رووەکانەی کە ئەگەرێنەوە بۆ بنەمالّەی پاقلەیی یەکان وەك پاقلەو فاسۆلیاو بەزالیاو لۆبیا .

## ٤ – کاربۆهیّدراتەکان

ئەمانە پێك هاتوون لە کاربۆنو هایدرۆجینو ئۆکسجین وە ووزە دەرئەچیّ وەپەیدا ئەبیّو لە ئەنجامی بەکارهێنانی کاربۆهیدرات لەلەشی مرۆڤوە ئەمانە زۆرن لە پەتاتەو شوتیو سێوی بنئەرز وەگەلیّ رووەکی تردا وەشێوەیان جیا جیایە بە گوێرەی رووەکەکان .

لەمانەی پێشوو وە دیارەکە کە پێویستە هەموو مرۆڤیّ پێویستی رۆژانەی خۆی بخوات لە سەوزە وە هەموو ڤیتامینەکانو جۆرەکانی تری خواردنی پێویست وەك پرۆتینو کانزاکانو کاربۆهیدرات بۆ لەشی مسۆگەر بکات بۆ ئەوەی تەندروستی باش بێت .

وە بۆ زۆرتر روون کردنەوە لەم خشتەی خوارەوەدا بەراوردی گرنگی خۆراکی سەوزە ئەکەین بەچەند جۆرێکی خواردنی تروەکو گۆشتو شیر کە ئەژمێردرێن بە دوو سەرچاوەی گرنگی خواردەمەنی بۆ ئەوەی دەربکەویّ کە خواردنی سەوزە چەند سوود بەخشە وە دەربکەویّ ئەو سودانەی لەخواردنی سەوزە دەست ئەکەوێت زۆر بەنرخترە ئەگەر بەراوورد بکرێت لە رووی ئابوری یەوە .

**سەرچاوەکان**

١ – مبادئ علم البستنه دانانی (دکتور کریم صالح عبدول)و دکتور (سعد زغلول النجار) (مؤسسة دار الکتب للطباعة والنشر) جامعة الموصل . ١٩٨٤ .

٢ – (انتاج الخضراوات) دانانی (دکتور کریم صالح عبدول) وە ئەوانی تر (مؤسسة دار الکتب للطباعة والنشر) جامعة الموصل ١٩٨٠ بەشی یەکەم .

# منالی ناوشوشە

"Tube-baby"

"طفل الانابيب"

ئەکرەم قەرەداخی

لە ئینگلیزیەوە کردویەتی بە کوردی

بێ‌پیتی بەلای‌کەمەوە ٥٪ی کۆی ژن‌هێنان ئەگرێتەوە ، لە گەڵ ئەوەی بە بارێکی ناهەموار دانانرێت . بەڵام ئەبێتە مایەی نیگەرانی لەبەردەم ژن‌و مێردا . نزیکەی سی‌یەکی ئەم گرفتە ئەتوانرێت دەستی یارمەتی تیادا درێژ بکرێت بە هۆی وەرگرتنی گەمیتی پیاو ژنەکەوە (واتە تۆو هێلکە – وەرگێر) ، تا لە تاقیگە هەوڵی پیتاندنیان (أخصاب) بدرێت ، پاش ئەوەی لە شوشەدا پیتاندنەکە روو ئەدات ئەوسا هێلکە پیتراوەکە ئەخرێتە ناو منالدانی (رحم)ی دایکەکەوە ، ئەم تەکنیکە ناو دەبرێت بە گواستنەوەی کۆرپەلە (Embryo transfer) ، زانیاری لەم بارەیەوە بە خێرایی پێش دەکەوێت ، ئەم ووتارەش هەوڵدانێکە بۆ کورتکردنەوەی هەڵوێستی ئێستا :

## مێژوو :

پتر لە چارەکە سەدەیەك لەمەوبەر م . س . چانگ کە لە بۆستن‌و ماساچوتس کاری دەکرد راپۆرتێکی دەربارەی لەدایك بوونی کەروێشکێکەوە بلاوکردەوە پاش ئەوەی پیتاندنەکەی لە شوشەدا جێ‌بەجێ کردبوو ، ئەوسا کۆرپەلەکەی گواستبووەوە بۆ منالدانی دایکێکی دیکەی وەرگر ، شەش سال دوای ئەوە لە گۆڤاری Lancetدا سالی ١٩٦٥ ، دکتۆر روبرت ئەدوارد دەربارەی یەکەم هەوڵدانی خۆی بۆ پیتاندنی هێلکەی مرۆڤ دوا ، لە سالی ١٩٧٦ یش‌دا یەکەمین سك پربوون بەهۆی پیتاندنی هێلکەی مرۆڤەوە لە شوشەدا رووی‌دا لە سالی ١٩٧٨ یش‌دا یەکەمین منالی ناو شوشە لە ئینگلتەرە لەدایك‌بوو ، لەوکاتەوە ئیتر ئەو مەڵبەندانەی خەریکی پیتاندنی ناو شوشەن لە زۆربوون دان بە تایبەتی لە بریتانیاو ئوسترالیا وئەمەریکا . وسەدان منال لە ئەنجامی ئەم تەکنیکەدا لە دایك بوون .




وێنەی هێلکەدانو منالدانو بەشەکانیان



## گیرانی جۆگەی فالوب :

دیارترین باری پەنابردنە بەر پیتاندن لە شوشەدا بریتیە لە نەبوونی یا پچراندنی بۆریەکانی فالوب[1] بە شێوەیەك کە لە توانادا نەبێت چاك بکرێتەوە ، تاقە ڕێگای دانپیانراوی چارەسەرکردنی گیرانی ئەو بۆریانە ، نەشتەرگەریە ، بەلاَم ئەنجامی سەرکەوتن لەم ڕێگایەدا دەکەوێتە نێوان ١-٧٠٪ لە کردارە جیاوازەکاندا ، زۆربەی ئەو کەسانەی دووچاری ئەمەبوون وپەنا ئەبەنە بەر پیتاندن لە شوشەدا تەنها یەك هەولیان لەبەردەمدایە لە نەشتەرگەری بۆریەکاندا . لە زوویەکەوە نەشتەرگەری بە یەکەم چارەسەرکردن ماوەتەوە ، زانا ئوستڕالیەکانی پیتاندن لە شوشەدا ، پێشنیاری ئەوەیان کردوە کە ئەگەر سەرکەوتن لە نەشتەرگەری‌دا لە ٢٠٪ کەمتر بوو ، ئەوا پەنابردنەبەر چارەسەرکردنی پیتاندن لە شوشەدا بە چاکتر ئەزانرێت ، بەلاَم ئێستا ئەم ڕاگەیاندنە تەنها بۆ ژمارەیەکی کەم جێبەجێ ئەکرێت ، تەنها لەوکاتەدایە کە ڕێژەی سەرکەوتنی پیتاندنی ناو شوشە لە ٢٠٪ زیاتر بێت .

ئێستا دەرکەوتوە کە جگە لە گیرانی ناو بۆریەکان هۆی‌تر زۆرە بۆ پەنا بردنە بەر پیتاندن لە شوشەدا وەك تۆوکەمی ، تێك چوونی لینجە مادەی ملی منالّدان ، بەردەوامی دوومەلی ناوپۆشی منالّدان ، هەروەها ئەو نەزۆکیانەش کە هۆیەکانی نازانرێت .

تۆوکەمی Oligospermia :

لەبەر ئەوەی پێتن لە شوشەدا پێویستی بە ملیۆنێك تۆو کەمترە ، بۆیە ئەم تەکنیکە بەکاردێت بۆ ئەو پیاوانەی کە بڕێکی زۆر کەم تۆویان هەیە ، ئەوانەی کە هیچ ڕێگایەکی تری چارە سەرکردنیان نیە ، لە ڕاپۆرتێکەوە کە لە یونیتی ستیپتۆ ئەدوارددەوە دەرچوە ، ڕاگەیەنراوە کە حەوت سكپڕبوون لە ئەنجامی پیتاندن لە شوشەدا جێبەجێ کراوە لەو ژنو مێردانەی کە گرفتەکەیان بریتی بوە لە تۆوکەمی‌یەکی وا کە لە نیوملیۆن تۆوی چالاکیان کەمتر هەبوە لە یەك ملمتر تۆواودا (السائل المنوي Semen) ، بۆ یانزە ژنو مێردیش کە کێشەکەیان بریتی بوە لە کەمی ژمارەی تۆوەکانیان لە ١٠ ملیون / مل دوو سکپڕبوون بە ئەنجام هاتوە بەم ڕێگایە .

ئاوساندنی تۆواوەخانەکانو کەم جولەیی تۆوەکان و وبەرەو پێشەوە نەچونیان ، لە هەرە ئەو هۆیە گەورانەن کە کار دەکەنە سەر کەم کردنەوەو تێکدانی توانای پێتینکردنی سروشتی . .

تۆژەرەوە ئوستڕالیەکان نوسیویانە کە ئەو پیاوانەی توشی تۆوکەمی زۆر بوون «واتە لە ٥ ملیون بۆ هەر ملمترێك تۆواو»



توانایەکی زۆر کەمیان هەیە لە پیتاندنی هێلکەدا لەگەڵ ئەوەشدا ئەتوانرێت بە ئاسانی لەم ژمارەیە بڕێکی تەواو تۆوی بزوێنی چالاکی لێ ئامادە بکرێت بۆ مەبەستی پیتاندن لە شوشەدا .

ئەگەرچی تا ئێستاش بە تەواوی ڕێگایەکی نمونەیی نیە بۆ دیاریکردنی توانای پیتاندنی تۆواو ، بەلاّم ئاشکرایە کە گەلێك هۆیتر جگە لە ژمارەی تۆوەکان لەم بارەیەوە کار دەکەن .

**تێکچونی لینجە مادەی ملی منالّدان :**

سەرکەوتنی پیتاندن لە شوشەدا ، وەك چارەسەر لە تێکچونی ملی منالّدان یا دوومەلی ناوپۆشی منالّدان ، یا هەموو هۆیەکی دیکەی نەزۆکیو نەپیتاندن ئێستا بە گران ئەپێورێت ، بەلاّم مەلّبەندی سەرەکی ئەمەریکی ڕاپۆرتیداوە کە ڕێژەی سەرکەوتن لەم جۆرانەدا زیاترە وچاکترە وەك لە بارەی نەپیتاندن بە هۆی گیرانی ناو بۆریەکانەوە . لە ڕاپۆرتەکەیاندا ئەوەیان دەرخستوە کە نزیکترین ڕێژە (کە بریتی بوە لە ڕوودانی سكپڕبونێك لە ناو تۆ نەخۆش‌دا) هی یەکێك بوە کە توشی نەپیتاندن بوە بە هۆی ملی منالّدانەوە ، کە تیایدا لینجە مادەی ملی منالّدان دەبوە هۆی وەستانی جولەی تۆوەکان ، بەلاّم هیچ دژەتەنێك (اجسام مضادة : antibododies)ی دژی تۆوەکانی تیا دەرنەکەوتوە ، لە حەوت نەخۆشی تردا کە دژە تەنەکانی دژی تۆوەکانیان تیادا دەرکەوتبو دوانیان بە ڕێگای پیتاندنی ناو شوشە سکیان پڕبوو

**دوومەلّی ناوپۆشی منالّدان Endomertriosis**

پەیوەندی نێوان دوومەلی ناوپۆشی منالدان ونەپیتاڵدن (نەزۆکی) بە تەمو مژی ماوەتەوە ، ژنێك کە توشی دوومەلی ناوپۆشی منالّدان بوبێت بە زۆری بۆریەکانی فالوب تیایدا کراوەیەو ئاشکرایە ، لە وانەیە گرفتی ئەم ژنانە لەکارنەکردنی ئاسایی بۆریەکان یا دەرنەپەڕاندنی هێلکەکانەوە بێت لە چیکلدانە پێگەیشتوەکاندا[٢] هەردوو بارەکە توانای یارمەتی دانیان هەیە بە هۆی ڕێگای پیتاندن لە شوشەدا .



یەکێك لە مەلّبەندەکان ئەوەیان دەرخستوە کە ڕێژەی سكپڕبوون لە ناو ئەوژنانەی کەتوشی دوومەلی ناوپۆشی منالّدان بوون لە نێوان ٣٠٪ تا لە ٤٠٪ دایە ، بەلاّم ئەم ژمارەیە لەوانەیە بەتەواوی بەسەر ئەو ژنانەدا نەچەسپێ کە توشی دراندن وەپچڕاندنی ملی منالّدان بوون بە هۆی ئەم بارەوە .

**ئەو نەزۆکیانەی هۆکانیان وونە :**

دیسانەوە پیتاندن لە شوشەدا یارمەتی ئەو ژنانەش ئەدات کە بۆریەکانی فالووبیان لەبەر هەر هۆیەکی نەزانراوبێت فەرمانەکانی خۆیان نابینن بە باشی واتە تێکچون ، ئێستا هیچ ڕێگایەکی ئەوتۆ نیە بۆ تاقیکردنەوەی توانای بۆریەکانی فالوب کەوا هێلکەکانی تیادا خێرا بکرێت بە شێوەیەك کە بەرێکوپێکی بە



دەرهێنانی هێلکە بەبەکارهێنانی میکرۆسکۆبی سلك



فەحس کردنی هێلکە دوای دەرهێنانی لەژێر گەردبیندا

ناویدا برۆن ، بە پیێ‌ی راپۆرتی هەندێك لە کۆمەڵەزانا رێژەی سەرکەوتنی پیتاندن لە شوشەدا لەوبارانەی هۆکانیان ئاشکرا نیە کەمترە لە وانەی کەتوشی گیروگرفتی ناو بۆریەکان خۆیان بوون ، بەڵام هەندێکی‌تر لەو باوەڕەدان کە جیاوازی نیە لە نێوان هەردوو بارەکەدا وە ئەوەیان پیشان داوە کە ئەو بارانەی هۆکانیان دیار نیە لە ئەنجامی کۆمەڵە هۆیەکی مێ ‌ینەوە یە کە بە تەکنیکی ئەمڕۆ تاقی ناکرێتەوە .

**هەڵبژاردنی نەخۆش** :

ئێستا دەرکەوتوە کە سەرکەوتن لە کرداری پیتاندنی ناو شوشەدا بەندە بە تەمەنی ئافرەتەکەوە ، ئەوژنانەی لە سەرو چل ساڵیەوەن لە پرۆگرامی پیتن لە شوشەدا وەرناگیرێن ، پیویستە نەخۆشەکە تەندروستی گشتی زۆر باش‌بێت ، ئەوانە شیان کە قەلەون هەوڵیان لە گەڵدا ئەدرێت تا لاواز ئەبنەوە ، لە وانەشە پیویست بکات وێنەی تیشکی‌ی مناڵدانیان بگیرێت ئەگەر لەوەپێش توشی دڕاندنی مناڵدان بوبن ، ولێ نوڕینی حەوزیش بە پیویست ئەزانرێت ، وئەگەر پیویستیش بوو سلك قلیش ئەکرێ بۆ بەرەلاّ کردنی هێلکەدانەکان تا وایان لێ بکرێت توانای گێرانەوەی هێلکەیان هەبێت ، زۆر جار نەبوونی پارەی پیویست بۆ ئەم کردارەش ئەبێتە هۆی وەرنەگرتنی هەندێك نەخۆش لە پرۆگرامەکەدا هەروەها ئەم رێگایە لەبار نیە بۆ ئەو کەسانەی بە هۆی هەر بارێکی ئاینیەوە گومان لە رەوشتی پرۆگرامەکە ئەکەن .

**دەرهێنانی ناو چیکلدانەکان** :

لە زۆر لە مەڵبەندەکاندا ، هێلکەی پێگەیشتو راستەوخۆ بەبینراوی بە هۆی قلیش لەسکەوە دەرئەهێنرێ ، سەرتاپای لەشی مرۆڤەکە سر ئەکرێ وئامیری لێ‌نوڕینەکەش هەر ئەو رۆژە دەرئەهێنرێتەوە ، ئەو ئامیرە تایبەتیانەش کە بە ووردی بۆ ئەم مەبەستە بەکاردێن بریتین لە دەرزی دەرهێنان ، بۆریەك یا دووبۆری ، پەستێنەرێکی مژۆك .

سەری دەرزیەکە دەخرێتە ناو چیکلدانەکەوە ولەسەر خۆ شلەی چیکلدانەکە دەرئەهێنرێ وبەوردی لەژێر میکرۆسکۆبدا سەیر ئەکرێت بۆ ئەوەی بزانرێت هێلکەی تیایە یان نەء ، ئەگەر نەبوە ئەوا چیکڵدانەکە لە گەڵ ناوەندەکەیدا دەشۆریت تا هێلکەی لێ دەربهێنرێت ، ئەگەر چیکلدانەکە درا ئەوا هەندێك جار هێلکەکە لە رێگای تورەکەی دۆگلاسەوە[٣] .

دەرهێنانی هێلکە راستەو خۆش لە چیکلدانەکانەوە لە رێگای پێستەوە لە ژێر کاری دەنگی سەروبیستنەوە (ئەلترا ساوند) بۆ یەکەم جار لە سالی ١٩٨٠دا بوو ، دەرزیەك کە تیرەی دەرەوەی ١ر٤ ملم بوو لە رێگای میزەڵدانیپرەوە راستەوخۆ ئەکرێت بە چیکلدانەکەدا بە هۆی دەرزی دۆزەرەوەی سەروبیستنەوە . هەندێك لە زاناکان سرکردنی گشتی بەکار دەهێنن ، بەلآم سرکردنی تەنها ئەو ناوچەیە لە گەڵ ، ئاگاداری تەواوی پزیشکی ، بەسە .

تەمەنەکەمی نەخۆشەکە رێگا نادات بە بەکارهێنانی ئەم رێگایە لەبەر زۆری ئازاری لە کاتی کونکردنی میزەلدان وهێلکەدانداا ، لەوانەیە کەسەکە توشی میزخوێنی ببێت بەلآم لەپاش چەند سەعاتێك نامێنێت ومیزەکەی روون ئەبێتەوە ، لە بەکارهێنانی ئەم رێگایەدا راپۆرتەکان وا دەگەیەنن کە لە ٩٠–٩٥٪ ی ئەو نەخۆشانەدا هێلکەکە دێتە دەرەوە ، هێلکە لە رێگای زێ (مهبل)یشەوە دەردێت بە تایبەتی لەو نەخۆشانەی کە هێلکەدانیان کەوتۆتە خوارەوەو قولترە لە تورەکەی دۆگلاس .

ئەوە ئەمێنێتەوە کە ئایا دەرهێنانی هێلکە لەژێر کاری ئەلتراساوندەوە بە هۆی نەشتەرگەری سکەوە بە تاقە رێگا ئەمێنیتەوە یان نا ؟

بەلآم تەکنیکیەکان بەو هیوایەوەن کە هێلکەدانی نەخۆشەکە لە بارێکی وا دابێت پیویستی بە سك هەلدرین نەبێت .

**تەکنیکیەکانی تاقیگە – ئامادەکردنی تۆو** :

مێرد ، تۆوی نوێ بەهۆی دەستەوە پەیدا دەکات . بە دوو



پیتاندنی هێلکەو خستنە نێو شوشە

سەعات پێش بەکار هێنانی تۆاوەکە ئەخرێتە (سێنتەر فیوجەوە) (جهاز الطرد المرکزي) وبە میدیۆمەکەوە بەند دەکرێ ، بەشی سەرەوەی (کەبرێکی زۆری تۆوی چالاکی تێدایە) بەکار دەهێنرێت نزیکەی ١٠٠٠٠٠ تۆو بەکار دەهێنرێت بۆ یەك کرداری پیتێن .

**چاندنی کۆرپەلە** :

هێلکەکە بۆ ماوەی ٤–٦ سەعات ئەخرێتە ناو (کەلچەر میدیا)کەوە پێش ئەوەی تۆوەکانی بکرێت بەسەردا ، ئەگەر بریاری ئەوەش درا کە هێلکەکان ماویانە وپێ نەگەیشتون ئەوا لە شوشەکەدا ئەهێلیرێتەوە تا پێ دەگەن ئەوسا تۆوەکانی بەسەردا دەکرێت .

هێلکە ١٢–١٨ سەعات تۆویان بەسەرەوە ئەبێ ئەوسا لە ژێر میکرۆسکۆبدا تەماشایان دەکرێت بۆ ماوەی ١٦ سەعات .




منداڵێکی پێنج مانگی لە منداڵدانی دایکیدا

بۆ ئەوەی بزانرێت ئایا پتێن روی داوه یان نا ؟ ! کە بە هۆی دەرکەوتنی دوو ناوکی دیارو پۆلەتەنی دوەمەوە دەبێ ، شەق‌بوونی یەکەمی هێلکە لە پاش ٢٤–٣٠ سەعات پاش پیتێنەکە روو دەدات لە پاش ١٠–١٢ سەعاتی دیکە ئیتر خانەکان دوا بە دوای یەك دابەش دەبن .

## تەکنیکی بەستوو :

زۆر مەڵبەند سێ هێلکەی پتراو بە یەك جار ئەچێنێت بەڵام هێلکە دانی هاندراو لەوانەیە ٧ هێلکە زیاتر بەیەك جار بهێنێتە بەرهەم لەیەك سوردا ، لە بەرئەوە هەڵگرتنی هێلکە زیادەکان بە شێوەی بەستوو وبەکارهێنانیان لە جاری دواترا تاقی کراوەتەوە ، تاقی کردنەوەکان دەریان خستوە کە ئەو هێلکانە ناتوانن بە بەستوی هەڵگیرێن ، لەبەر ئەوە ئەیان پیتێنن ئەوسا هەلیان دەگرن . یەکەم سك پڕبوونی سەرکەوتو لە رێگای کۆرپەلەی بەستووەوە (کەتیایدا کۆرپەلە بەستوەکە خاو دەکرێتەوە ئەخرێتە منداڵدانی دایکەکەوە – وەرگێر) لە لایەن گروپی پیتاندنی ناو شوشەی زانکۆی مۆناش Monash university یەوە لە ساڵی ١٩٨٣ دا رویدا .

لە تشرینی یەکەمی ساڵی ١٩٨٤دا هەر ئەم تاقە ٦٨ کۆرپەلەی بەستو (دوای خاوبونەوەیان) گواستەوە لە گەڵ لەدایکبونێکی سەرکەوتو وپێنج سکپڕبونی بەردەوامیش ، گەلێك مەڵبەندی تریش توانیویانە سك پڕبونی تەواو لە رێگای کۆرپەلەی بەستوەوە بەدەست بهێنین

## گواستنەوەی کۆرپەلە :

ئەمەنێکی دیاری کراوی تەواو نیە تا ئێستا بۆ هێلکەی پیتراو کە بگیۆزرێتەوە ناو منداڵدان بەڵام ئێستا بەزۆری لە کاتێکدا ئەمە بە ئەنجام دێت کە هێلکەکە دابەش‌بوبێ بۆ ٢–٤ خانە .

هاوکێشی نێوان بەکارهێنانی هێلکەی پتراو بەزووی کە ماوەیەکی زۆرتر ئەبوایە لە شوشەدا بمایەتەوەو بەکار هێنانی هێلکە پیتراوەکە بە درەنگی واتە کۆئەندامە سروشتیەکان تیایدا هان ئەدرێ (هەروەك ئەو کۆرپەلەیەی گەیشتۆتە قوناغی ٨–١٦ خانەیی ئاساییە .

کۆرپەلەکە دەخرێتە ناو قەبارەیەکی زۆر بچوکی کەلچەر میدیۆمەکەوە ئەوسا لە رێگای ملی منداڵدانەوە ئەخرێتە ناو بۆشایی منداڵدانەوە ، بە هۆی قەستەرەیەکی تایبەتی

ئامادەکراوەوە ، بە زۆری پێویستیشی بە بەنج کردن نیە ، تەنها ئەوەندە نەبێت پاش کردارەکە نەخۆشە کە بۆ چەند سەعاتێك لە جێگادا ئەمێنێتەوە .

چاندنی کۆرپەلە لە ناو منالّداندا کارێکی زۆر گرنگ نیە ئەگەر بەراورد کرا لە گەلّ هەنگاوەکانی تری پیتێن لە شوشەدا ، رێژەی سك پربوون لە پاش جێ گرتنەوەی کۆرپەلەیەکی باش و دیار لە ٢٥-٣٠٪ زیاتر نیە لە هەرە چاکترین مەلّبەندەکانی ئەم کارانەدا . بە تایبەتی لە بەرئەوەی کاتی گەشەکردنی ناوپۆشی منالّدان ریك ناکەوێت لە گەلّ کاتی گەشەی کۆرپەلەکەدا .

پێش کەوتنی تەواو لە کاری چاندنی کۆرپەلەدا ئەوکاتە دەبێت کە بزانرێت گەشەی ناوپۆشی منالّدان چەندە بە هۆی پێوانی پرۆتینی ناوپۆشی منالّدانەوە کە دەکرێتە خوێنەوە ، بەلاّم ئەم جۆرە تاقیکردنەوەیە تا ئێستا لە تواناادا نیە بۆ بەکارهێنانی تاقیگەیی .

**ئەنجامی سك پربوون :**

ئەنجامی کارەکانی پیتێن لە شوشەدا تا ئێستا ئەوە دەرئەخەن کە هیچ زیاد بونێك نیە لە پەیدابوونی تێکچونە زگماکیەکاندا (التشوهات الخلقية) ، لەوانەیە مەترسی لەبارچوون زیاتر بێت ، بەلاّم هیوایەکی زۆر هەیە کە ئەو مەترسیەش وەك چونیەتی چاندنەکان سەلماندویانە رێژەکەی کەمتر ببێتەوە ، لەبەرئەوەی لەیەك کۆرپەلەش زیاتر دادەنرێت بۆیە رووداوی دوانە (جمك) زیاتر ئەبێت ، لە بەرئەمەشە لەبارچوون زیاد دەکات رێژەی کرداری قەیسەری [illegible] یایدا بەرزەو ئەشێ منالّ بوونەکەش سروشتی بێت .

**پاشە رۆژ :**

ئەمێنێتەوە ئەوەی ئایا مەلّبەندە سەرەکیەکانی پیتێن لە شوشەدا ئەتوانن رێژەی سك پربوونە باشەکانی ئێستا چاکتربکەن وبەرەو باشتری ببەن ؟ یا مەلّبەندەکانی تر پێش برکێ ی ئەنجامەکانی ئەوان ئەکەن ؟ وەکارێکی وا ئەکەن کە پیتێن لە شوشەدا دەست ژمارەیەکی زۆرتر لە ژن و مێرد بکەوێت و کەلکی لێ وەرگرن ؟ ، پێش کەوتنی ئەم کردار دەبێتە هۆی راوێژ لەسەر کردنێکی زۆری ناو کۆنگرە رۆژنامەکان دەربارەی بەرئەنجامەکانی لە بارەی رەوایەتی (الشرعية) و رەوشتایەتیەوە (الاخلاقية) و یاساو رژێمەوە .

ئێستا لە ئوستراليا سك پربونێکی سەرکەوتو بە دەست هاتو کە لە ئەنجامی بەخشینی هێلکە یەکەوە رووی داوە لە ژنێکەوە بـ یەکێکی دی گفتو گۆیەکی ناخۆش وزیان بەخشیش روی داو لەسەر چارەنوسی کۆرپەیەکی سڕبوو کە باوك و دایکی [illegible] رووداوێکدا کوژراون .

لەبەریتانیا گفتوگۆیەکی زۆر هەیە کە ئایا پێویستە توێژنەوە بەردەوام بێ لەسەر کۆرپەلە یان نا ؟ وئەگەر وا بێ تا چ تەمەنێك بێت ؟ ! ئێستا میری لیژنەیەکی پێکهێناوە بریاریان داوە کە کاتی رێ پێدراو نابێت لە چواردە رۆژ تێپەر بکات بەسەر پیتانی هێلکەکەدا . (واتە نابێت هێلکە پیتراوەکە چواردە رۆژ زیاتر بـ بەستویی بمێنێتەوە - وەرگێر -) بەلاّم هێشتا ئەمە لە لایەن پەرلەمانەوە دانی پیا نەنراوە .

**سەرچاوە :**

Jo. Drife : (In vitro fertilization)
Med. Digest – vol . 11 No . 11.
November 1985 PP4 – 10.

**پەراوێز :**

١ - بۆریەکانی فالوب : Fallopian tubes

دوو بۆرین لە لایەن زانای ئیتالی گابریل فالوپیس (Gabriel Fallopius)ەوە (١٥٢٣-١٥٦٣) دۆزرایەوە . درێژی هەریەکەیان ئەگاتە ١٦ر١٠ سم سەرێکیان و[illegible] منالّدانەوە وسەرەکەی تریان نزیکی هێلکەدانە . کاریان گواستنەوەی هێلکەیە لە هێلکەدانەوە بۆ منالّدان ، زۆر جار لە شیردەرەکاندا بە هێلکە جۆگە Oviduct ناو دەبرێن - وەرگێر -

٢ - چیکلدانە پی گەیشتوەکان : مەبەست چیکلدانەکانی گرافن . ولە هێلکەداندان . هەر چیکلدانەیەك هێلکەیەکی تێدایە . پاش پی گەیشتنی هێلکە . هێلکەکان بە جۆگەی هێلکەدا دەچنە منالّدانەوە - و -

٣ - تورەکەی دوگلاس Pouch of Douglas

پەراوێز :

(١) - پەنیری گرۆییر : Gouyere cheese

پەنیرێکی زەردە . کونی خرخری زۆر ووردی تێدایە .

# سلاڤ ل سفرا حازره

ئەمین حەیدەر بۆتانی

پێشتی دەرگەهێ ڤێ بابەتێ بـ قوتین . پێدڤیە خویا کەین کو خارن ئانگۆ مەبەستا ڤێ نڤیسارێ مشه د هێت بەرچاڤ لـ گەلەك دەراڤان شتی کو تۆلازەك نارینا بەر دلکێ خوه دپەیڤی و لێڤێن وێ د ئازرینی : شرینا من هەکه رۆژێ سێ جاران ته نەبینم ئەز نـکارم بـ خۆمو بـرازم . ئانگۆ خارنا مەبوویه ئاخین . . دگەل هندێ ژی خارن شەنگاستا ژیانێیه هەڤبەری نڤیستنێو باوەرێ ، کو ئەو تەڤدا دخزمەتا ساخلەمییا مرۆڤ دانه ، لەورا تو جار مرۆڤ نکارییەو نکارت بێ بەهربت ژ خارنێو دویره پەرێز ژێ راوەستیت . نەمازە لـ دەراڤێن شینو تازیو هەلکەڤتنێن جەرگ‌برو دل تەزین . ژبەرکو (مرۆڤ بـ خارنێ مرۆڤه) چونکی پیدڤییه بۆ ساخلەمیو گەشەکرنا ئەندامێن لەشێ مرۆڤ . .

دیسا دکارین بێژین کو خارنو چێکرنا وێو زۆر بوونا تەورێن وێ گرۆڤەکه ژگرۆڤێن پێش‌کەڤتنا گەلان ئانژی تەخان ، لەورا ئەگەر دێنێ خوه بـ دەینە جڤاتگەهامه . د بینین کو گەلێ کورد هەمی دەرگەهێن ژینێ قوتاینەو چەند گۆتن ژێرا هلداینه ، بـ شێوەکێ تەڤایێ هەمی دەراڤێن ژینو ژیارا خوه .

ئەگەر نەبت هەر قولاچەك تونه هەبوویه کو پالەو جۆتکار بـ گەهن هەڤ پشتی کو بـ درێژاهییا رۆژێ خوهـ ڤەمالینەو بێت هاتینه مال بـ لەشەکێ هەرشیایێو شکەت ، ئویشتی ڤێ چەندێ ژی دەستێن خوه دانانه سەر زگەکی تێر .

هەکه بێژین ژی چەوا ئەڤ گۆتنه ژ دایك بووینەو رستکا تۆرامەپێ دەولەمەند بوویه . تو نەبت ژنك یا گەهاینه هەڤ دوو چ لـبەر ئاڤێ بیتنو چ لـ رێکا کانییێو هەر ئێك ژوان پەسن ژخوارنێن خوه داینه . ئانکو پاله لـ دەمێ داسێن خوه دانانه سەر ملێ خوەو هەمی پێکڤه کۆم بووینه . ڤێجا دەلیڤ خوەش بوویه کو گێنگەشا وان دەست پێبکەتو هەر ئێك پەسنا کابانیا خوه بکەن ، کو تو ژنەك نینه میناوێ دوغەڤایێ ئانکو گرارێ لێبنێت . ئانگۆ تەمۆ بێژیت هەکه مه دروینه تەڤاف بو دێ ترشکێ دەمه هەوه . بەلێ چ ترشك ؟ ئەوا سینەم هەجا لێ دنێت ئانژی لـ شەڤێن زڤستانێ پڕ سەرماو سۆلو سەقەم ، کو دەرو جینار کۆم د بن لـ دۆر ئاگردانەکێو تاکو درەنگی شەڤێ لاچکێن ئاخڤتنێ د کرۆژنو دانو ستانێ د شارینن ، بەلێ ئەڤانا پشتی کو گێسناوان چ بەیار نەهێلایه مال ئاڤایی ژ هەڤ دوو کرنەو خوەشییا ئەلندەکی روهن بۆ هەڤ خاستنه .

ڤێجا مه دڤێت بێژین سفرا کوردان تازەیەو مه دڤێت وێ شروڤەو خویا کەین . د ڤردە کوردناسێ هێژا (ڤ – مینو سکی) پشتا مه دگریت دڤێ ئاخڤتنێ لـ دەمێ چوویه سەردانا هەڤالێ خوه (سەردار موکریانی)و شاش بوویه دەمێ دیزا کوردان

دیتی‌یەو دل خوەش بوویە دەمیٚ ئەڤ سفرا جوانو هەمی ڕەنگ د بەرا وی دانیە ، کو د بێژیت : (خزمەتکارو جووتیارەکان خواردەمەنی زۆر جۆراو جۆریان هەلگرتو هێنایان بۆ ناو باغچەکەیان کە بەدەورو پشتی حەوزێکدا چەند خیوەتێك هەلدرابون . نانی نیوەڕۆمان خواردوو ، دووای ئەوە چایی‌و جارێکی‌تر خواردنو هەمووشی لەگەل ئاوازی گۆرانی‌و مۆسیقادا بوو ، ئەم دەعوەتەش تەنها بۆ ئێمە نەبوو ، بەلکو قازانێکی گەورە برنجیشیان ئامادە کردبوو بۆ خزمەتکارەکان ، وەهەرگیز ئەو دوو ماسی‌یە گەورە قەلەوەم لەبیر ناچێتەوە کە بەتایبەتی بەم بۆ نەیەوە ڕاوویان کردبوونو . . . هتد)[1] .

ژبەرکو ئاخڤتنا مە ل سەر خارنێ‌یە ، ئەم ژی بـ ڕۆلا خوە ، تەمەت قەیناغێن خوە کو لـ قاسکێن ئەڤێ گەنمێ وەربهێتو داسێ مە بـ گەهیتێ ، سوالەکێ لـ دویف ڤەژەنا خوە دکەینو ئەڤێ نڤیساریێ شروڤە دکەین ، هەکە نەکارین ژی مل بـ ملی پالێن زەند پر هێزو سوالە پر هەڤرکی‌یێ بـ کەین ، لێ‌تونەبە دکارین گولە گەنمێن کەڤتی کۆم بـ کەینو لـ دویف ڕێچا وان وشی‌یا بـکەین . . دڤردە د هێ‌ینە سەر گێشا خوەو دێ بژارکین ، شتی کو مە بەهایێ خارنێ خویاکرو ڕۆلا خارنێ چیە بۆ مرۆڤی ، ژبەرکو خارن نەبت ژیان نابە . دۆزا مەژی هەرگاڤ لـپێناڤا نانی‌یە ، ئەڤ دانو ستانو شەڕەنیخە ژی‌کو بەرچاڤ د بە هەرۆ لـ سەر دەبەکا شانۆیا ژینێ . هەمی ژبەر بـدەست هینانا خارنێ‌یە ، لێ بـڕێکەکا ڕاستو دروستو بـ ڕومەت .

تاکو گەلەك ژ هۆزانڤانێن مە یێن کورد ، نەمازە یێن کلاسیکی هۆزانێن خوە مشە بـ سەیرانو گەشت خارنێ ڤەهاندینە ، ژ هەمیا پێتر (ئەحمەدێ نالبەندە) لێ نکارین بنڤیسین ژ بەر دەلیڤ تەنگی‌یێ بژل ژ هندەك دێرکە هۆزانان . .

دڤردە کو بهێینە سەر هۆزانێت وان ، دێ لە سەر گوتنێت فۆلکلوری چین ، ئو دێ بەرێ خوە دەینێ کانێ چەوا بـ ڕەنگەکێ جوانو دل ڤەکەر پەسنا لـ خوارنێن خوە داینەو لـ پەی هەڤ دێ‌وان ڕێزکین :-

– ساڤار ئالیکا مێرایە .
– ئەگەر ساڤارە
– خوەش گرارە .
– ئەگەر ساڤارو شەربەتە
– نازو نەعمەتە .
– ئەگەر ئیپراغە
– ڕوینی لێ بکەداغە .
– ئەگەر پەلاڤە
– گولێ بـ خوناڤە .
– هەلاتی
– بەرێ خو بـ دە ولاتی .
– ئەگەر دۆینە
– بـ خۆ لە بۆ من نەینە .
– دۆغەڤا
خۆشی‌یێ هەوە
بۆمە نەما
– کەلە دۆشە
ڕوین ل سەر بۆشە .
– نانو ماست
تێشتێ بـ ڕاست .
– نانو دۆ
تێشتێ بـ درۆ
– ترشکە
پری ناوی کفتکە .
– کاردی بەساردی
تەختێ مرادی . .

گەلەك گۆتن هەیە ڕەوشا هەژاران خویا دکەتو بهانە بوونێ ژێ دهی‌وهەژاران د پەیڤی‌و ڕێکا ڕاستو چەڤت دیار دکەت . هەچکو کەلەپور سامانێ مللەتی‌یە . دبینین کو ئەڤ

«زاری کرمانجی . گۆڤارێکی کۆمەلایەتی و ئەدەبی و مێژوویی و فەنی بووە . لە ڕواندز لەلایەن حوسێن حوزنی موکریانی‌یەوە «٢٤» ژمارەی لێ دەرچووە . دوا ژمارەی لە ساڵی ١٩٣٢دا دەرچووە .» .

هەروەها دەڵێ : «ئێمە چەند ژمارەیەکیان لێ‌ی دیوە . چاومان بەهەر «٢٤» ژمارەی نەکەوتووە . هەرچەندە داوامان لە گیوی موکریانی کاکی حوزنی کرد کە یارمەتیمان بدا . بەلام هیچ یارمەتی‌یێکی نەداین . بەڵکو داوای کرد ئەو ڕۆژنامەو گۆڤارانەی خۆی و کاکی دەریان کردووە باس نەکرێن» .

بەلام کاك «جمال خەزنەدار» لە لاپەڕە «١٤٧»ی هەمان سەرچاوەدا لە ستوونی سێیەمدا دەڵێ :

«وە لە ساڵانی ١٩٢٦-١٩٣٢ . ٣٢ ژمارە لە گۆڤاری زاری کرمانجی دەرکردووە .» .

بەم جۆرەو . بەپێ‌ی ئەم زانیاری‌یانەی کە لەو سەرچاوانەی سەرەوەدا هاتووە . بۆمان دەردەکەوێ کە تا ئێستا ساغ نەبۆتەوە گۆڤاری زاری کرمانجی چەند ژمارەی لێ دەرچووە . ئەڵبەتە شاغ‌کردنەوەی ئەم خاڵە بە پلەی یەکەم دەکەوێتە ئەستۆی بنەماڵەی موکریانی . چونکە لە هەموو حاڵەتێکدا ئەوان لە کەسانی دیکە شارەزاترن‌و . بابەتی ئەم باسەی ئێمە نی‌یە .

5 – A. M. Hamilton. Road through Kurdistan. The Narrative of an Engineer in Iraq. London. 1937. PP. 122 – 123, 237.

ئەم پەراوێزە دوکتۆر کەمال لە «تێگەیشتنی ڕاستی‌ی»دا ژمارە «١٠٨»ی داوەتی‌و . یەکێکە لەو سەرچاوانەی سوودی لێ وەرگرتووە .

٦ – جون ك . م . روذنشتین . اختراع الطباعة . «تأريخ العالم» المجلد الخامس – ص ٦٤٧-٦٤٩ .

ئەمەیش پەراوێزی ژمارە «١٠٩»ی کتێبی «تێگەیشتنی ڕاستی‌ی»یە . کە نووسەر سوودی لێ وەرگرتووە .

٧ – کەمال مەزهەر ئەحمەد – تێگەیشتنی ڕاستی‌ی لاپەڕە «٨٥-٨٦» .

٨ – دزەیی : ئەو بنەماڵەیەن کە ڕۆڵەکانی کانی خۆی لە «دزە»ی گەورەی سەر سنوری نێوان وولاتی عیراق‌و ئێران‌و تورکیادا دانیشتوون . قەرەنی ئاغای گەورە لە دێ‌ی دزەوە هاتۆتە ناوچەی هەولێر . هاتنەکەیشی دەگەڕێتەوە بۆ پێش زەمانی دەسەلات‌داریەتی میر محەمەدی گەورە کە لە ڕەواندوز فەرمان ڕەوا بووە . ئەو بنەماڵەیە لەسەرەتادا بە کۆچەری‌یەوە خەریك بوونە . بەلام نزیکەی ١٠٠ تا ١٥٠ ساڵێك دەبێ وازیان لە کۆچەری هێناوەو لە دەشتی هەولێر ، لە ناوچەکانی «قوشتەپەو قەراج‌و کەندیناوەو . شەمامك» . نیشتەجێ بووینەو . لە دێهاتەکانی ئەم ناوچانەدا بوونەتە خاوەنی مەڕو ماڵات‌و . کشت‌وکاڵیان کردووە . لە ناوەڕاستی پەنجاکانەوە دێهاتەکانیان جێ‌هێشتووەو هاتوونەتە نێو شاری هەولێرەوە . . نەوەی قەرەنی ئاغای گەورە ، چوار بەرەبابی لێ کەوتۆتەوە کە ئەمانەن : «بەرەبابی بایزی . بەرەبابی ماڵی فارس ئاغا ، بەرەبابی ماڵی پاشا . بەرەبابی ماڵی کاکە خان»ی . کە ئەمانە هەموویان لە ڕەچەڵەکدا دەگەڕێنەوە بۆ شەر قەرەنی ئاغای گەورەو . لەنێو خەڵکیش‌دا بە وەجاغی قەرەنی ئاغا ناو دەبرێن ، سەرۆکایەتی گشتی‌یان دەمێکە لەنێودا نەماوە .

ئەمە جگە لەوەی کە هەر بەرەبابێك لەوانەی کە لەسەرەوە ناومان بردوون سەرۆکی تایبەتی خۆیانیان بووە .

٩ – گوندی هێلەوە : سەر بەناحیەی قوشتەپەیە لە پارێزگای هەولێرو . یەکێکە لە گوندەکانی بنەماڵەی برایم ئاغا .

١٠ – مەلا ئەفەندی : ناوی ئەبوو بەکری کوڕی حاجی عومەری کوڕی ئەبوو بەکرە . نازناوی «کوچك مەلا» بووە . لە ساڵی «١٢٨٠»ی کۆچی لەشاری هەولێر هاتۆتە دونیاوە . لە مزگەوتی گەورەی قەلای هەولێر ، لەلای باوکی خوێندوویەتی . مەلا ئەفەندی پیاوێکی زاناو لێهاتوو ئایین پەروەر بووە . تەنانەت لە دەرەوەی وولاتی عیراقیش‌دا بەناوبانگ بووە . گەلێ زانای گەورەی ئایینی لەسەر دەستی ئەم زاتەدا ئیجازەی ئایینیان وەرگرتووە . وەکو : «شێخ مستەفای نەقشبەندی ، وهبةالله أفندی – «موفتی قەسر» . مەلا عبداللەی مەریوانی . سعید عبدالله ئەفەندی موکریانی ، عبدالفتاح ئەفەندی شوانی . شێخ محەمدی خاڵ . حاجی مەلا صالحی کۆزەپانکەیی‌و زۆرانی تر . .» .

ئەم زاتە مەزنەیش لە ساڵی ١٩٤٢دا بەنەخۆشی کۆچی دوایی کردووە .

١١ – مشیر ئاغا یەکێك بووە لە سەرۆك عەشیرەتەکانی دزەیی . ٤٥ ساڵ ژیاوە . ماوەیەك «حاکم»ی ناوچەی مەخموور بووە . لە ساڵی ١٩٤٥دا کۆچی دوایی کردووە . ئێستا برایەکی ماوە بەناوی هاوار ئاغا . ئەمە جگە لە کوڕو نەوەکانی کە لە شاری هەولێردا دادەنیشن .

١٢ – ئەم دوو دێڕە شیعرە «مەلا هەوایی» گوتوویەتی‌و . دەماودەم بەنێو خەڵکی‌دا بلاوبوونەتەوە ، منیش کانی خۆی لە «حاجی قادر مصطفی‌و . لطیف اسماعیل قورچی»م بیستووەو ، تۆمارم کردووە . بەلام ئەم دوو زاتە ئێستا لە ژیاندا نەماون .

١٣ – ئەمەیش هەر دیسان «مەلا هەوایی» گوتوویەتی‌و . دەماودەم بلاوبوونەتەوە . دواجار لە «خورشیدی حەسەنە ڕەشم» وەرگرتووە ، کە هاوچەرخی مشیر ئاغا بووەو . مەلا هەوایی دیوە ، ئەم زاتەیش واتە «خورشید» خەڵکی مەخموور بووەو . لە ساڵی ١٩٨٤دا کوچی دوایی کردووە .

١٤ – مەلا حسێن شێخ سەعدی – دیوانی شیعر – کۆکردنەوەی «بشیر حسین سعدی» . چاپخانەی ڕۆشنبیری‌و لاوان – هەولێر – ساڵی ١٩٨٤ . لاپەرە / ٢٧ .

١٥ سیاو : گوندی مشیر ئاغایەو . دەکەوێتە ناحیەی قوشتبە . کە سەر بە پارێزگای هەولێرە .

## ● سەرچاوەکان ●


● د . کەمال مەزهەر ئەحمەد ، تێگەیشتنی ڕاستی‌ی‌و شوێنی لە ڕۆژنامەنوسی‌ی کوردیدا لە چاپکراوەکانی کۆڕی زانیاری کورد – ١٩٧٨ . ل : ٨٥ . ٨٦ . ٢٣٤ . .

● مێژوی ئەدەبی کوردی – علاءالدین سجادی ، چاپی دووەم ١٣٩٠ﻫ-١٩٧١م . بەغدا – چاپخانەی معارف – لاپەرە ٦١٣ . .

● جمال خەزنەدار ، رابەری ڕۆژنامەگەری‌ی کوردی – دار الحریة للطباعة – مطبعة الجمهوریة ، بغداد ، وەزارەتی ڕاگەیاندن – کارگێری‌ی گشتی ڕۆشنبیری‌ی کوردی ١٩٧٣ ، لاپەرە «٣٣ ، ١٤٧» . .

● گۆڤاری زاری کرمانجی . ساڵی دووەم – ژمارە «٣» . لاپەرە «٢» .

● زبیر بلال اسماعیل – علماء ومدارس في أربیل چاپخانەی «الزهراء موصل» لاپەرە «٣٢-٣٥» .

● مەلا حسێن شێخ سەعدی – دیوانی شیعر ، کۆکردنەوەی بشیر حسین سعدی – چاپخانەی ڕۆشنبیری‌و لاوان – هەولێر ، ساڵی ١٩٨٤ . لاپەرە – «٢٧» . .


* * *


• – پڕ بەدڵ سوپاسی دوکتۆر کوردستانی موکریانی دەکەم کە دڵسۆزانە گۆڤاری زاری کرمانجی خستە بەردەستم‌و . ئەم ماوەیەی بۆ ڕەخساندم کە ئەم باسەی لێ هەڵێنجم .

• – هەروەها سوپاسی کاك ممتاز حەیدەری دەکەم کە ئەویش لەم ڕووەوە یارمەتێکی چاکی دام .

# کاروانی رۆشنبیری لە کوردستاندا

**هەولێر** دژوار

## ڕاوچی

دەزگای گشتی سینەماو شانۆ – تیپی نواندنی هەولێر لە ڕۆژی ١٩٨٦/١١/١و ڕۆژانی‌ترو لە هۆڵی (ابن المستوفی)دا شانۆگەری (ڕاوچی) نووسینی ئەدیبی لاو حیدر عبدالرحمن‌و دەرهێنانی هونەرمەند مامۆستا صفوت الجراح پێشکەش کرد. دەربارەی چالاکی ئەم تیپەو ئەم شانۆگەریە. مامۆستا الجراح



دەڵێ: «تیپەکەمان، ماوەیەکە خووی داوەتە پێش‌کەش کردنی درامای شانۆی خۆماڵی.. چ ئامادەکردن‌بێ لە کەلەپورو فۆلکلۆری کورد چ نووسینی تایبەت بە شانۆی کوردی بێ جا بە بیروڕای ئێمە ئەو هەنگاوانەی تیپ دەربارەی هەڵس‌کەووتی لەگەڵ نووسەران‌و ئامادەکەرانی تێکستی شانۆی کوردی هەنگاوێکە بۆ دامەزراندنی دوا ڕۆژو گەیشتنمان بە ڕاستیەك‌و ڕێ خۆشکردنە بۆ پێگەیاندنی نووسەری شانۆنامەی تایبەت بە شانۆی کوردی» ئەکتەرەکان بە گشتی: سمیرە عبدۆك – دایك، سوسن سعدون – نارین. غازی غفور – پیرەمێرد. خلیل یابە – بەگ، محمود احمد – کوێخا. مؤید محمد فقی – سمە، سلام کۆیی – چەتۆ. سیروان عثمان – سمکۆ. ابراهیم حکیم – دینۆ، انور عزیز – جوتیار. خالد محمد عبدالله – پاسەوان (١)، سۆران جلال – پاسەوان (٢). زهیر سعدون – منداڵ (١). نجدت صفوت. رأفت صفوت. سامی سعدون – منداڵ (٢، ٣، ٤). ڕزگار احمد – ڕەشۆ.

ئەو مامۆستاو هونەرمەندانەیش بە شداری کارە هونەریەکانیان کرد: عبدالواحد مرجان‌و هونەری کوری. عبدالجبار جمیل‌و عبدالقادر محمد مصطفی. شاهین نجم‌الدین، کامران خۆش‌نووس. شیرزاد محمد حسین. انور عزیز، مؤید فقی.

## کۆڕێکی فۆلکلۆری

دەزگای ڕۆشنبیری‌و بلاوکردنەوەی کوردی. لە ڕۆژی

۱۹۸٦/۱۱/٦ له هۆڵی ڕۆشنبیری جەماوەردا کۆڕێکی بۆ مامۆستا ڕۆستەم باجەلانی شاعیر لە ژێر ناونیشانی (جنێو دووعالێکردنی میللی لە ڕووی سایکۆلۆژییەوە) سازکرد . لە سەرەتاوە مامۆستا محمود زامدار گوتی (بەبێ جووندانو دوعالێکردن ئەڵێم : مێژووی هەر نەتەوەیەکی سەر ڕوی ئەم زەمینە جۆرە خاسیەتێکی خۆماڵی تێدا هەیەو پێوەی ڕسکاوە ، دیاریشە لە ئەنجامی گەلێ هۆی تایبەتیو مەوزوعیەوە . . مێژووی ئێمەی کوردیش ، فۆلکلۆرمان بە حیکایەتو پەندو ئەفسانەو داستانەکانیەوە سەرەڕای هاوبەشبوونی لەگەڵ گەلانی‌تر ، ئەو جۆرە خاسیەتەی سەربەخۆیەی خۆی لە تەك خۆیا پەلکێش کردووەو بەشێکە لە دابونەریتی ئەم کوردە سەمەندەرەو ئاوێنەی بالاّ نمای باری دەروونیەکەی ئەنوێنێ لەبیرمە جارێکیان مامۆستایەك قاموسێکی ڕووسی پێ‌نیشان‌دام کە لە ناوەڕۆکیم پرسی : وتی ئەمە قاموسی جوێنی ڕووسی‌یەوبە هەزاران دانەشی لێ‌چاپکراوە) .

دوا بە دوای ئەمە مامۆستا ڕۆستەم باسەکەی خۆی بەم پێشەکیە دەست پێ‌کرد : (ئەدەبی کوردیی نەنووسراو بە گشت لایەنەکانیەوە کۆنو نوێی ، ڕەنگ‌دانەوەی واقیعی گەلی کوردە ، کوردیش وەك گەلێ نەتەوەی‌تری سەر ڕووی زەمین خاوەنی جۆرەها بابەتی فۆلکلۆری‌یە . . بەرلەوەی بێنە ناو باسەکەمان ئەوەی ئاشکراو ڕوونە ئەم بابەتە فۆلکلۆری‌یە لە نێوان گشت نەتەوەکانی جیهانا هاوبەشە ، دوورنی‌یە لە جۆرە بابەتێکی فۆلکلۆری‌دا دوو نەتەوە یان زیاتر نەگەنە یەك وەك (لاوكو حەیران) بەڵام ئەم بابەتە شێوەیەکی جیهانی گرتۆتەبەر . واتە هەموو نەتەوەیەك بە گوێرەی مەبەستو ئارەزوو پێداویستەکانی ژیان بەکاریان هێناوە) دوا بە دوای ئەمە گوتی : (دەبێ ئەوەشمان لەبیر نەچێتەوە ئەم جنێو دوعالێکردنانە هەندێکیان لە شێوەی شیعرو پەخشان یان ڕستەیەکی مۆسیقایی بەکارهێنراون . گەلێ وەسفو وێنەو جوانکاری تێدایە . دڵو دەروون دەخورپێنن ، سەرەڕای ئەمانەش شارەزاییەکی قووڵی سایکۆلۆژیو فەلسەفی‌یان تێدایە) .

جنێو دوعالێکردن بەپێی قۆناغی تەمەنو ڕەگەز ، بەم جۆرە دابەش دەکرێ : ژنو پیاو ، منداڵ ، گەورەو منداڵ . کاکی موحازیر هەر قۆناغەو چەند نموونەیەکی خستە ڕوو لە ڕووی جنێو دوعای خراپو چاك ، سەرەڕای ئەمەیش چەند نموونەی عەرەبیو توورکی بەرامبەر بە نموونە کوردیەکان هێنایەوە .

دوا بە دوای ئەمە هاتە سەر جنێو دوعالێکردن لە چیرۆکی فۆلکلۆریدا . ئینجا لە مەتەڵی کوردیدا ، لە بەشی پەندی پێشینانـدا چەند نموونەی هێنایەوە «دوای باریك بادە ، لە ژنی بێ‌حەیا لادە» دوا بە دوای ئەمە چەند نموونەی جنێو دوعای یاری منداڵانی باسکرد . بۆ ئەوەی بە گشتی شارەزایی لە باسەکەی کاك باجەلان وەرگرین بەم شێوەی خوارەوە دابەش دەکرێ :

- پێشەکی
- قۆناغی تەمەنو ڕەگەزی جنێو دوعالێکردن .
- جنێو دوعالێکردن لە ڕووی چاکەوخراپە .
- جنێو دوعالێکردن لە لای لایەی دایکدا .



● جنێوو دوعالێکردن لە چیرۆکی فۆلکلۆریدا .

● جنێوو دوعالێکردن لە مەتەڵ . یاری منداڵان . پەندی پێشینان ، ساوارکوتان . دروونە . دڵداری . گاڵتەوگەپ . شایی‌و هەڵپەرکێ .

● ڕەنگ‌دانەوەی بابەتی باسەکە لە ئەدەب‌و شیعری کوردیدا .

● جنێوو دوعالێکردن بە ئیشارەت ، فیتە فیت . ڕەوانبیژی ، ئەزەوەز .

لە کۆتایی باسەکەدا چەندان ئەدیب‌و ئەدەب دۆستان گفتوگۆیان لەسەر باسەکرد .

●

## پارێزگاری مافی دانەر

●

دەزگای ڕۆشنبیری‌و بلاوکردنەوەی کوردی لە ئێوارەی ١٩٨٦/١١/١٧ لە هۆڵی ڕۆشنبیری جەماوەردا کۆڕێکی بۆ پارێزەر فکرت عزت شفیق بەناونیشانی (قانونی پارێزگاری مافی دانەر) سازکرد . لە سەرەتاوە مامۆستا محمود زامداروتی ( . . . مرۆڤێ هەقی خۆیەتی چۆن‌و بە چ شێوەیێ بیر ئەکاتەوە چ دائەهێنێ‌و چ بەرهەمێکی ئەدەبی‌و هونەری‌و زانستی پێشکەش ئەکات . . ئایا ئەو هەقەی داهێنەر بە خۆیەوە لکاوە . ئایا کەس ئەتوانێ دزی لێ‌بکات‌و ئەو هەقەی لێ‌وەرگرێ ، ئایا ئەبێ ئەو داهێنەرو دانەرە واز لەو هەقە بهێنێ . . ئەمەیان باسەکەی برای پارێزەرکاك فکرەتە) .

دوا بە دوای ئەمە کاك فکرەت هاتە سەر باسەکەی‌و گوتی : (نامەوێ بە هیچ جۆرێك ناوی کەس بە خەراپە بێت ، چونکە ئەوەی من لێرەدا باسی دەکەم ئەوەیە کە ئایا لەم وولاتەدا یاسایەك هەیە بەرگری لە مافی داهێنان بکا ؟ ئێمە ئاستی پێشکەوتی میللەتان لە ئەدەب دادەبینێ . لەبەر ئەوە زۆر کەسی تەمبەل‌و بێ‌توانا هەوڵی ئەوە دەدا لەسەر حیسابی ئەوانی تر بژی‌و بەناو بانگ‌بی . ئەمە لەلایەك لەلایەکی تریش ئەگەر گۆڤار یان ڕۆژنامە قسەیەکی ناشیرین بۆ یەکێ بلاوبکاتەوە ، دەبێ کەسی قسە پێ‌گوتراو چی‌بکاو چ دەبێ . . ئەم پرسیارەو چەندانی تریش لەم باسەدا وەلامی دەدرێتەوە ، هەرچەندە ئەم قانوونە تا ئێستا لەلایان ئەدیبی کوردو عەرەب کاری پێ‌نەکراوەو هەردەم ئەدیب نایەوێ کاری پێ‌بکا . . ڕەنگە کەمووکوری هەبێ بەلام هەروەك خۆتان دەزانن هەموو قانوونێك لەسەرەتاوە بێ‌کەمووکوری نابێ بەلام بە درێژایی ڕۆژ ئاڵ‌وگۆڕی بەسەردادێ . لە عیراقدا لە ساڵی ١٩٧١ قانوونی مافی دانەرکە عوسمانی بوو لە ١٩١٠/٣/٨ لەلایەن معروف الرصافی شاعیر تەرجەمەکرابوو هەندێکیشی لەلایەن دکتۆر صلاح‌الدین الناهی وەرگێردرابوو . کاری پێ‌دەکرا) .

ئەوەی شایانی باسە ئەم قانوونە لە ١٩٧١/١/٤ بە ناوی قانوونی پارێزگاری مافی دانەر دەرچوو . کە بریتی‌یە لە (٥٣) مادە . دوا بە دوای ئەمە ، باسەکە گفتوگۆی لەلایەن ئامادەبوان لەسەرکرا .

●

## گۆرانی کوردی‌و چەند سەرنجێك

●

دەزگای ڕۆشنبیری‌و بلاوکردنەوەی کوردی لە ڕۆژی ١٩٨٦/١١/١٣ لە هۆڵی ڕۆشنبیری جەماوەردا کۆڕێکی بۆ هونەرمەند لوقمان بابەرەسووڵ بەرزنجی سازکرد . لەسەرەتاوە مامۆستا محمود زامدارکاك لوقمانی پێشکەش بە ئامادەبوانی کردو

باسی گرنگی بایەخدان بە گۆرانی و مۆسیقای کوردی کرد . دوا بە دوای ئەمە کاك لوقمان بەرزنجی باسەکەی خۆی بەم بەرکولە دەست پێ‌کرد (هونەری ئاوازو گۆرانی بەشێکی گرنگە لە چالاکی بیری هەموو نەتەوەیەك‌و بەستراوە بەو کۆمەڵەی تێیدا دەژین . چونکە هەر لەو کۆمەڵەدا سەری هەڵداوەو ئەرشیفێکی روونە بۆ مێژووی بەسەرهات‌و تەعبیری لە ژان‌و خۆش‌و حەزەکانی کردووە . ئەگەرچی گۆرانی فۆلکلۆری کوردی تارادەیەك بەرگری لەمانی خۆی کردووە . ئەویش بە متمانەکردنی ئەو مرۆڤانە لەو سەدانەی بەدوای یەکەوە داهاتوون ، لە رەورەوەی مێژوو هەڵبەتە هێندێکیان دووچاری هەڵبزرکان‌و لەناوچوون بوونە . جا سنووردانان بۆ مەفهوومی گۆرانی فۆلکلۆری کارێکی ئاسان نیە . . لەکاتی مامەلە کردندا لەگەڵیادا ، ئەوانەی بەتەکی گۆرانی فۆلکلۆری هاتوون چەندین رای جیاوازیان هەبووە لەم بوارەدا . ئەگەرچی ئەم رایانەیش پەسندبن لە ئەنجامدا بەتێکرایی گەمارۆی بابەتەکە دەدەن ئەویش بە ژیاندنەوەی کەلەپووری نەتەوایەتی بە شێوەیەکی زانیستیانە لە رووی ئامادەکردن‌و پێشکەشکردنی دا) .

دوا بە دوای ئەم پێشەکیە کاك لوقمان هاتە ناخی باسەکەیی لەسەرەتاوە بەم پرسیارە لەخۆکردنە : ئایا بە درێژایی ئەو شازدە ساڵەی رابوردوو هونەرمەندی مۆسیقاژەن‌و دەزگا هونەریە مۆسیقیەکان لە کوردستاندا چ داهێنێکیان کردووە لە بواری بەرەوپێشەوەچوونی کوردی ؟ ئێمە ناڵێین هونەرمەندی کورد بەرامبەر بەو هەموو جولانەوە مۆسیقیەیی جیهانی هونەرمەندی ئێمە دەستەو ئەژنۆ دانیشتوەو سەیری ئەو عالەمە بکات . بەڵکو رۆڵێکی چاکی بینیوە بەڵگەیشمان ئەو بەرهەمانەی تیپی مۆسیقای هەولێرو سلێمانیە لە ناوەراستی حەفتاکان‌و دوا بەرهەمی تیپی مۆسیقای دهۆکە . بەڵام ئەمەیش مەحاوەلات بووە لەم بوارەدا ، کەچی دووبارە دووچاری نوشوستی بووە . ئەمەیش هەڵبەتە بێ هۆ نەبووە !) .

ئەوەی شایانی باسە دەتوانین باسەکەی کاکی بەرزنجی بەم



شێوەی خوارەوە دابەش بکەین :

١ – ئاواز لە گۆرانی فۆلکلۆری کورد .

– ئاوازی مەقامی کە بەبێ (ریتم) دەگوترێ .

– ئاوازی ئیقاعی .

٢ – گۆرانیە بێژەکانمان‌و هەڵویستیان لە مەقامە کوردی‌یەکان .

٣ – گرنگترین مقەومات کە پێویستە لە گۆرانی‌بێژ رەنگ بداتەوە .

٤ – گرنگترین مقەومات کە پێویستە ئاوازدانەر هەیبێ .

دەربارەی دابەشکردنی مەقامەکانی کوردی کاکی موحازر بەم جۆرەی خوارەوەی دابەشی‌کرد : لاوك . حەیران . قەتار ، اللەوەیس ، ئای‌ئای . سیاچەمان . خاوکەر . رەش‌بەست ، شوشتەیی ، رەنجوری . خورشیدی . غەمەنگیر ، نیوە شەوێ ، سەفەر ، ئەمانە هێندێکیان وەکو سکێل‌و نموونەی بۆهێنایەوە بە دەنگی گۆرانی بێژە کۆنەکان‌و بەئامێری (ئۆکوردیۆن) روون دەکردەوە .

لە کۆتاییدا کاك لوقمان زامی بزووتنەوەی هونەری کوردی بەم جۆرە نیشاندا (دەبا بەردەوام بوونی ژیانی ئەو مەقامانە کوردیانە خەمی گەورەی هەموو لایەکمان بێ‌و بتوانین پارێزگاری

له مانی بکەین دوور له شپرزه بوونو لەناوچوونی چونکه هەریەك له ئێمه بەرپرسیاره بەرامبەر بەو نەوانەی لەدوای ئێمه دڵسۆزی ئاوازو گۆرانی کوردین هەوڵی ئەوە بدەن ئەم مەقاماتە کوردیانە بە ئەرکی خۆیان بزانن‌و توانای وتنیان هەبێ بە هەموو برگەکانی‌و هەوڵی رۆشنبیری هونەری بدەن) .





## سلێمانی

ئازاد

**شانۆ :-**

### «گۆشەکان»

دامەزراوی گشتی‌ی سینەماو شانۆ - بەشی شانۆ - تیپی شانۆی سلێمانی / شانۆیی‌ی «گۆشەکان»ی لەسەر شانۆی ئامادەیی‌ی سلێمانی‌ی کوران پێشکەش کرد .

ئەم شانۆیی‌یە له نووسینی کاك «دڵشاد مەریوانی»و دەرهێنانی کاك «کاوە جووتیار»بوو ، رووداوەکان له پێنج دیمەندا چڕ دەبوونەوە ، هەر دیمەنەو حاڵەتێکی کۆمەلایەتی‌ی



دەخستە روو .

لەو ئەکتەرانەی لەم شانۆییەدا بە نواندن هەڵسان :-

(یاسین کەریم ، نەرمین قادر ، نەوزاد تۆفیق ، کامەران فەتاح ، پیران مەجید ، دڵسۆز محەمەد ، یاسین بەکر ، بێستوون محەمەد ، نەبەز بەکر ، جەمال عەزیز ، میدیا سەباح ، محەمەد جەلال) .

کارە ئیداری‌و هونەریەکانیش بەم جۆرە دابەش کرابوون :-

| | |
|---|---|
| بەڕێوەبەری بەرهەم | عەلی حەمە رەزا |
| بەڕێوەبەری شانۆ | ئاکۆ سدیق |
| یاریدەدەری دەرهێنەر | مەریوان ئیبراهیم |
| دیکۆرکێش | رێبوار مەحموود |
| رووناکی | نەوزاد تۆفیق . نەبەز بەکر |
| مۆسیقا | یاسین بەکر |
| پۆستەر | نەوزاد تۆفیق |
| جلو بەرگ | رێبوار مەحموود |

نمایشی شانۆیی‌یەکە له ٢٨-١٠-١٩٨٦وە دەستی پی‌کردو تا ناوەراستی مانگی ١١-١٩٨٦ بەردەوام بوو .



● **پیشانگا** :-

● له ڕۆژانی ۲۰ تا ۱۹۸٦/۱۰/۳۱و له هۆلی گەلەریی سلێمانی ، کۆمەڵەی هونەره جوانەکانی کورد - مەڵبەندی گشتی سلێمانی ، پیشانگایەکی تایبەتی بۆ هونەرمەندی لاو «ئازاد سابیر» کردەوە ، تیایدا کۆمەڵێك کاری نوێی خۆی پیشاندا .

- ئازاد سابیر ساڵی ۱۹٦۸ له سلێمانی له دایك بووه .

- ساڵی ۱۹۸٤ یەکەم پیشانگای تایبەتی خۆی له سلێمانی کردووەتەوه .

بەشداری لەم پیشانگایانەدا کردووه :-

- پیشانگای هاوبەشی چوار هونەرمەند - له سلێمانی ساڵی ۱۹۸۲ .

- پیشانگای شەشەمی هونەرمەندانی سلێمانی .

- پیشانگای گشتیی هونەرمەندانی کورد - له هەولێر ساڵی ۱۹۸٦ .

«پیشانگای هاوبەشی سێ هونەرمەند»

کۆمەڵەی هونەره جوانەکانی کورد - مەڵبەندی گشتی - سلێمانی ، پیشانگایەکی هاوبەشی بۆ هونەرمەندان :- (عومەر دەروێش ، عومەر ڕەسوڵ ، سامان قادر) له هۆلی گەلەریی سلێمانی کردەوه .

هونەرمەند «عومەر دەروێش» لەم پیشانگایەدا به «۱۳» تابلۆ بەشداری کردبوو لەوانه :- (خوێن وهێز ، بانگەوازێك بۆ مێژوو ، سەرەتای ئازارەکان ، له نێوان شێوەو هۆش دا ، زامی شاخەوانێکی نووستوو ، ماسی خۆرەکان ، سەربازی ون) .

- ئەم هونەرمەندە له ساڵی ۱۹٥۷دا له سلێمانی هاتۆتە جیهانەوه .

- هاوبەشی پیشانگای ساڵانەی قوتابخانه سەرەتایی و ناوەندیەکانی کردووه .

- له ساڵی ۱۹۷۹دا هاوبەشی پیشانگای هونەرمەندانی سلێمانی کردووه .

- له ساڵی ۱۹۸٥دا بەشداری پیشانگای شەشەمی





هونەرمەندانی سلێمانی کردووە .

– لە ساڵی ١٩٨٥دا پیشانگای هاوبەشی لەگەڵ هونەرمەند «عومەر رەسوڵ»دا لە هەولێر کردووەتەوە .

– لە ساڵی ١٩٨٦دا هاوبەشی پیشانگای گشتیی هونەرمەندانی کورد – ی لە هەولێر کردووە .

هونەرمەند «عومەر رەسوڵ»یش بە «١٥» تابلۆ لە پیشانگاکەدا بەشداریی کردبوو لەوانە : (وێنەی دووەمی مرۆڤ ، مەرگ‌و خۆشەویستی‌یەکی بێ دەنگ ، شانۆگەریی نەوت فرۆشەکە ، شارەکەم ، بەرەنگاربوونەوە ، نەمرەکان ، لە دایك‌بوونی خۆر ، تەقینەوە) .

– هونەرمەند لە ساڵی ١٩٥٧دا لە سلێمانی هاتۆتە دنیاوە .

– لە ساڵی ١٩٧٥دا هاوبەشی پیشانگای پۆستەری رامیاریی کردووە – لە سلێمانی – .

– لە ساڵی ١٩٧٩دا پیشانگای تایبەتیی یەکەمی خۆی لە سلێمانی کردووەتەوە .

– لە ساڵی ١٩٨١دا پیشانگای دووەمی خۆی لە سلێمانی کردووەتەوە .

– لە ساڵی ١٩٨٢دا هاوبەشیی پیشانگای هونەرمەندانی عێراق لە ئیتالیا – کردووە .

– لە ساڵی ١٩٨٣دا هاوبەشیی پیشانگای حەوت هونەرمەندی لە سلێمانی کردووە .

– لە ساڵی ١٩٨٥دا هاوبەشیی پیشانگای شەشەمی هونەرمەندانی سلێمانیی کردووە .

– لە ساڵی ١٩٨٦دا هاوبەشیی پیشانگای گشتیی هونەرمەندانی کوردی لە هەولێر کردووە .

هونەرمەند «سامان قادر»یش بە بیست‌و یەك تابلۆ بەشداریی کردبوو ، لە تابلۆکانیشی :– (دەمو چاو ، هاوارو بێدەنگی ، سەرنج ، یادێك ، پشوو ، رق ، خەندە ، تێکشکان) .

– لە ساڵی ١٩٥٨دا لە سلێمانی هاتۆتە دنیاوە .

– دەرچووی پەیمانگای تەکنۆلۆجیا بەشی وێنەی ئەندازەیی‌یە .

– لە ساڵی ١٩٨٣دا پیشانگای هاوبەشی لەگەڵ (ئازا حەسیب) و (عومەر رەسوڵ)دا لە شاری کەرکوك کردۆتەوە .

– لە ساڵی ١٩٨٤دا پیشانگای تایبەتیی لە سلێمانی کردۆتەوە .

– لە ساڵی ١٩٨٥دا هاوبەشیی پیشانگای شەشەمی هونەرمەندانی سلێمانی کردووە .

– لە ساڵی ١٩٨٦دا هاوبەشیی پیشانگای هونەرمەندانی کوردی لە هەولێر کردووە .



## ● کۆڕ :-

«فارماکۆلۆجیی ڕووەکو
سروشتی ئینسان»

ئەمە ناونیشانی ئەو باسە بوو کە کاك «خەیام کارگەچی» لە کۆڕێکدا خوێندیەوە کە بەڕێوەبەرێتیی ڕۆشنبیریی جەماوەر لە بەرواری ١٩٨٦/١١/١٧داو لە هۆڵەکەی خۆیدا بۆی سازدا .

کاك خەیام باسەکەی خۆی بەسەر ئەم خاڵانەدا دابەش کردبوو :-

١ – قۆناغەکانی ڕووەك ناسیو ڕووەکی پزیشکی لە یەکەم بوونی مرۆڤەوە .

٢ – بەراوردێك لە نێوان دەرمانگەری ڕووەکی پزیشکی وڵاتانی دەرەوەو وڵاتی ئێمەدا .

٣ – چۆنێتیی دروست کردنی دەرمان لە کوردەواریدا .

٤ – هێڵی نەشونمای ڕووەك .

٥ – چارەکردن بە ڕووەکی پزیشکی لە کوردەواریدا .

«چیرۆکێكو هەڵسەنگاندنێك»

لە بەرواری ١٩٨٦/١١/١٤دا بەڕێوەبەرێتیی ڕۆشنبیریی جەماوەر لە سلێمانی کۆڕێکی چیرۆك خوێندنەوەی بۆ شاعیری لاو کاك «دڵشاد عومەر کاکی» سازدا . تیایدا چیرۆکێکی لە ژێرناوی «لەبەردەم ئاوێنەکەدا» خوێندەوە .

سەرەتا کاك «شەهاب عوسمان»و تەیەکی خوێندەوەو پاشان کاك «جەمال غەمبار» بە نووسینێك سەبارەت کۆڕەکە دوا . دوا بە دوای ئەمان چیرۆکەکە خوێندرایەوەو پاشانیش کاك «بەهات حەسیب قەرەداخی» هەڵسەنگاندنێکی لە ڕووی فۆرمی چیرۆکەکەوە خستەڕوو .

لە کۆتاییی کۆڕەکەدا هەندێك لە ئامادە بووان سەبارەت چیرۆکەکەو هەڵسەنگاندنە باری سەرنجی خۆیان دەربڕی . لەوانە چیرۆکنووس مامۆستا «شێرزاد حەسەن» . کۆڕەکە لە هۆڵی ڕۆشنبیریی جەماوەر سازدراو گەلێك لە ئەدەب دۆستان ئامادەی بوون .



# پۆستەی کاروان

سۆزان حەریری
ئامادەی کردووە

**خوێنەرانی هێژا :**

وا ژمارە «٥٣»یش کەوتە بەردەستتانو . لەگەڵ خۆیدا کۆمەڵە بابەتو بەرهەمێکی هەمەجۆری بەپێزو پڕ لە تامو بۆی کوردەوارییانەی بۆ هەڵگرتوونو . وەکو دیارییەکی پڕ بەهاو خنجیلانە پێشکەشتانی دەکات .

هەر لەگەڵ بابەتەکانی ئەم ژمارەیەشدا هەگبەینامەکانی ئێوەمان کردۆتەوەو وەڵامی کۆمەڵە بەرهەمێکی دیکەمان داونەتەوە کە لە کارواندا دابڕاونو وەبەر بڕیاری بڵاوکردنەوە نەکەوتوون .

**برا شیرینەکانم :**

ئێمە نکوڵی لەوە ناکەین کە هاوکاری ئێوە لەگەڵ گۆڤارەکەماندا باشترین بەڵگەی دڵسۆزیو وەفاداری ئێوەیە . هەروەها پشتگیرییەکی مەزنە بۆ پتەوتر کردنی بناغەی ئەدەبو رۆشنبیریی نەتەوەکەمانو ، بەرەو پێش بردنی رەورەوەی کاروانی شیعرو ئەدەبیاتی کوردیو زیندووکردنەوەو دەوڵەمەندکردنی کەلەپووری میللەتەکەمان .

بەڵێ ئەم هەوڵو کۆششەی ئێوە مایەی بەختەوەری هەموو لایەکە ، بەڵام وەنەبێ ئێمەش گلەییمان لەهەندێ کەمو کورتی ئەو بەرهەمانە نەبێ کە بۆمانی دەنێرن ، ئەڵبەتە مەبەستی سەرەکی ئێمەیش لەوەدا ئەوەیە کە هەوڵو کۆششەکەتان ئەنجامێکی چاکو بەسوودی ببێت . نەك هەر زۆرو بۆر بێتو بەس . .

**ئازیزان :**

هەر بۆیە دەڵێین ، خۆزگە تا بۆتان دەکرێ ئەو بابەتانەی بۆمانی دەنێرن ، شتی تازەبنو زۆر دووبارەو سێبارە نەبووبنەوە ، هەڵبژاردەو سوود بەخش بن بۆ زوربەی زۆری خوێنەران ، لێکۆڵینەوەکانتان لەسەر بناغەیەکی زانستیو دوور لەپەلەکردن دارژرابنو بەڵگەی راستو دروستیان لەگەڵدا هێنرابێتەوە ، دووربن لە سادەیی‌و ساکاری بۆ ئەوەی خوێنەر بە ناکامڵ لە قەڵەمیان نەداتو کارێکی سەلبیش نەکاتە سەر رادەی بەرەوپێش چوونی گۆڤارەکەمان . کە مەبەستمانە هەمیشە گۆڤارێکی کوردی نموونەیی بێت .

بەهەرحاڵ ئەمانە گلەیی برایانەنو ، هیواخوازین لە دا هاتوویەکی نزیکدا ئەنجامی بەکەڵکی خۆیانیان ببێتو ، ببنە بناغەیەکی پتەو بۆ هەوڵو کۆششی داهاتوو .

**ئێستاش ئێوەو وەڵامی بەشێکی دیکەی نامەکانتان کە بوونەتە میوانی ئەم ژمارەی گۆڤارەکەمان :**

● بۆ ئەم خوشك‌و برا ئازیزانەی بە شیعر بەشداری خۆیانیان نیشان داوەو ، «کاروان» یان بەسەر کردۆتەوە :

«سیروان حمید کۆیی ، ابراهیم احمد رەواندوزی ، فؤاد کارگێڕ ، کمال أسعد رەزا ، ئارام ئەحمەد جاف ، ابراهیم احمد جاف ، کامەران عبدالله خضر ، دلشاد طه عثمان ، فارس هەمزە اسماعیل ، رزگار حمدامین صالح ، احمد محمد ناصر، کمال سعدی کاوانی ، خەبات عبدالله محمدامین ، أیوب حمه کریم رشید ، فرهاد احمد حمه شەل ، أسعد جەباری ، ئەزوەر احمد پەرچەم ، مصطفی حسن احمد ، شەماڵ جمال کریم مامی ، سارال نظام عبدالله ، صابر کریم قادر ، صلاح‌الدین اسماعیل محمد جەباری ، ئازاد دلپاك ، ابراهیم عثمان رشید ، جوان ابراهیم قنبر ، فاخر سلیمان مجید ، مجید عبدالرحمن خۆشناو ، قارەمان غفور مورتکەیی ، ئازاد علي کریم ، یاسین احمد ابراهیم ، شۆڕش حمد مصطفی ، فریاد صابر ابراهیم ، محمد حسن محمد ، یەحیا دلگیر» .

پڕ بەدڵ سوپاستان دەکەین بەرامبەر بەم دڵسۆزی‌و هاری‌کاری‌یەی لەگەڵ گۆڤارەکەماندا کردووتانەو دەیکەن‌و لی‌ی سارد نەبوونەتەوە ، ئەڵبەتە ئەم نەفەس درێژی‌یەیشتان نیشانەی رێزو خۆشەویست یەکی پاك‌و بێگەردە بەرامبەر بە ووشەو نووسینی کوردی ، بەهەرحاڵ دەبی بمان‌بوورن کە بۆمان نەکرا ئەو شیعرانەتان پەسند بکەین بۆ بڵاوکردنەوە ، ئەویش لەبەر گەلی هۆی جیاجیا ، وەك لاوازی هەندێکیان لەرووی هونەری‌ی‌و ، ناکاملی هەندێکی دیکەو ، نەگونجانی بەشێکیشی لەگەڵ رەوت‌و رێبازی گۆڤارەکەماندا ، کە هەر هەموویان رێگەیان لەبەردەم بڵاوکردنەوەی بەرهەمەکانتان‌دا تەسك کردەوە ، هیواداریم بەرهەمی چاکترمان بۆ بنێرن‌و دووبارە رێزو خۆشەویستیمان بۆ ئێوەی دۆست‌و دڵسۆزی گۆڤارەکەمان . .

● بۆ خوشکە **«ئەختەر سەدیق»** :

سوپاست دەکەین بۆ ئەو شیعرەی بە ناونیشانی «راسپاردەیەك دوای بڕیاردان» بۆت ناردووین ، داخمان ناچی کە بۆمان نەکرا شیعرەکەت بەتەواوی بڵاوبکەینەوە ، بۆیە تەنها ئەم کۆپلەیەمان لی‌ی هەڵبژاردو ، پێشکەشی خوێنەرانی دەکەین :

**بڕیارمدا ، کەوا هەرگیز**
**چاوەکانم ،**
**ووشەی نامەت بەدی نەکا .**
**ووتەکانت ، زۆر مەحاڵە**
**مێشکی ماندووم لەگەڕ بخا .**

* * *

● **بو ئەو هاوری دڵسۆزانەی ئەم شیعرانەیان بۆ ناردووین** :

«ئاسۆی شارێکی مت ، چریەو راز ، عەشقی پیرۆز ، گوڵ پەریشان ، پاندانێکی فەلەستینی ، یادگاری لەدایك بووم ، دایە ، دووهەم جار ، بۆ جوانە شەهیدێکی ئەو دیو چیا – یا کچێکی مەهابادی ، چاوەکانت ، دیسان بارانە ، دیواری باخی بوون ، کۆچێکی وونو چەپکی یادی گەرم ، هەڵەز ، ساڵەهایە ، تابلۆ ، کورتە رازێك بۆ فریشتەی بەردی ماندووم ، دیاری‌ی نەورۆز ، شەپۆل‌و گریان ، ئاهەنگێکی گەروکی ، گوڵزاری دڵ ، ئەی یار ، گوڵێکم بوو . پیرۆزبایی» .

سوپاستان دەکەین بۆ ئەو بەرهەمانەی بۆتان ناردبووین . چاوەروانی شیعرو نووسینی دیکەتانین‌و هەربژین .

● **بۆ ئەو خوشك‌و برا بەرێزانەی ئەم چیرۆکانەیان بۆ ناردووین** :

«بەڵێن یا گاڵتە ، هەوارگە ، ژووانی شەوی بەفربار ، لەشەوێکی چاوەروانی‌دا ، کۆڤان‌و کەفر ، سەرەتای تورەبوون ، ژاندنەوە لە ئامێزی چاوەروانی‌دا ، جورج ، خاکم ئەپارێزم» .

پڕ بەدڵ سوپاستان دەکەین بۆ ئەو دڵسۆزی‌یەی لەنامەکانتانا دەرتان بڕیوە ، هەروەها بۆ هاوکاری کردنتان لەگەڵ

گۆڤارەکەماندا ، هیواخوازین لێمان دڵگیر نەبن کە ئەم چیرۆکانەی لەسەرەوە ناومان بردوون دەڵێین شیاوی بڵاوکردنەوە نەبوون ، چاوەڕوانی بەرهەمی دیکەتانین‌و دووبارە سوپاس .

● «نیشتمان» ، ناونیشانی ئەو شیعرەیە کە خوشکی ئازیزمان «گەلاویژ مەرزانی» لە شاری کۆیە بۆی ناردووین .

بەڵام بەداخەوە کە ئەم خوشکەمان هێشتا زۆری ماوە بیێ بە شاعیر ، بەهەرحاڵ وا ئەم پارچەیەمان لێی هەڵبژاردو پێش‌کەشی خوێنەرانی «کاروان»ی دەکەین :

«نیشتمان

خۆشەویستیت بەهارێکە
هەموو ساڵێ لەنێو دڵدا چرۆ دەکا
خۆشەویستیت مەشخەڵێکە
گڕو بڵێسەی لەئاگری نەورۆز دەکا

* * *

● بۆ ئەم خوشك‌و برا ئازیزانەمان :

«شاکر محمدامین ڕۆژبەیانی ، شڤان ڕەجەب دەرویش ، أنور عمر حەساری ، کاروان محمود عبدالرحمن ، عبدالقهار محسن سۆرانی ، ڕووناك شریف ، محمد خضر محمد ، ارکان بهجت عزیز ، فرهاد رمضان ابراهیم» .

سوپاس بۆ ئەو ئەرك‌و ماندووبونەتان ، بەداخەوە ئەو چیرۆکانەی ناردبووتان لەزۆر ڕووەوە سادەو ساکار بوون‌و مەرجی چیرۆکی کوردی‌یان تیادا نەدەهاتە دی ، بۆیە شیاوی بڵاوکردنەوە نەبوون ، هیواداریین لەداهاتوودا چیرۆکی چاکترمان بۆ بنێرن .

● بۆ ئەو برایەی ئەم شیعرەی بۆ ناردووین «پردی دووری» ،

لەگەڵ ڕێزو خۆشەویستی‌و دڵسۆزیمان بۆ ئەو برایە ، دەبێ بمان بەخشێ کە تەواوی شیعرەکەیمان بۆ بڵاو نەکرایەوە ، ئەمەیش کۆپلەیەکی شیعرەکەیەتی :

● پردی دووری ●

هۆ کچی جوان
خۆ دەزانی لێك بڕانو دووری یاران
تفت‌و تاڵە
وەك گوڕاڵکی دەست لێك بەردان
گەر سەر کۆنەو لۆمەم نەکەی
لێم ببووری
خۆم دەکەمە خاك‌و خۆڵ‌و پردی دووری
تا بەسەرما ڕابیووری .

* * *

● بۆ ئەو برایەی ئەم بابەتەی بۆ ناردووین :

«جەنگێ دژی ووشەی غەیب» .

کاکی برا هەروا بە هاسانی ڕەورەوەی پێشکەوتن‌و زانست‌و زانیاری ناگەڕێتەوە دواوە ، ئیمڕۆ چەرخی ئەتۆم‌و تەکنەلۆژیای پێشکەوتووە ، مەگەر نەت زانیووە کاروانی میللەتانی دونیا چەند بەخێرایی بەرەو پێش دەڕواو ڕۆژ نی‌یە داهێنان‌و دۆزینەوەیەکی زانستی نەیەتە کایەوە . زانستیش هەر ووشەیەکی سادەو ساکار نی‌یە ، بەڵکو دەمێکە هەقیقەت‌و بوونی زۆر شتی شاراوەی سەلماندووە ، کە تا دوێنێ کەم کەس باوەڕی پێ هەبوو .

● بۆ ئەو دوو خوشك‌و برا ئازیزەی ئەم بەرهەمەیان بۆ ناردووین :

«هێندێك مەتەڵ‌و دەق چەند پارچە هەڵبەستێکی فۆلکلۆری کوردی» .

پڕ بەدڵ سوپاسی ئەو دوو دۆستە ئازیزە دەکەین‌و پیرۆزبایی‌یان لێ دەکەین بۆ ئەم هەوڵە دڵسۆزانەیان ، بەڵام بەداخەوە بەرهەمەکەیان کە کۆیان کردۆتەوە ، بەشێکی یەکجار زۆری لەملاو لەولادا بڵاوبۆتەوە ، ئەمە جگە لەوەی کە هەندێکی بۆ بڵاوکردنەوە دەست نادا . بۆیە دەبێ بمانبەخشن لە بڵاونەکردنەوەی‌و ، چاوەڕوانی بەرهەمی

سەرکەوتووتریانین .

● **بۆ ئەم برا بەڕێزانە کە بەرهەمی فۆلکلۆرییان بۆ ناردووین :**

«صباح اسماعیل ، کەمال علی عەربەتی ، اسماعیل حسن قادر ، جمال قورشاغلویی ، عصمت محمد علی گۆران»

سوپاستان دەکەین بۆ ئەم ئەرکو ماندووبوونەتان ، هیوای ئەوە دەخوازین لەم بوارەدا زیاتر کۆشش بکەن ، بۆ ئەوەی ئەو رەنجەی دەیدەن بەرهەمێکی چاکتر بەدەستەوە بدات ، چاوەروانی بەرهەمو نووسینی دیکەتانین . .

● **بۆ ئەو برایەی ئەم بابەتەی بۆ ناردووین :**

«میر ئەبدالۆ صەبووری دوو هۆزانێت نەبەلاف» . .

کاکی برا ئەلبەتە هەموو لێکۆلینەوەو ساغ کردنەوەیەکی ئەدەبی وەیا زانستی ، پێشەکی دەبێ نموونەی ئەو بابەتەی لەگەلدابێ کە لێکۆلەرەوە باسی لێوە دەکا ، بۆ ئەوەی خوێنەرو کەسانی پەیوەندیدار بتوانن لە نزیکەوە ئاگاداری ئەو بەرهەمە بن کە لەبارەیەوە نووسراوە ، ئەگینا کارەکە ناکامل دێتە بەرچاو ، بابەتەکەی تۆش ئەم مەرجەی لەسەرەوە باسمان کرد تیایدا نەبوو ، بۆیە دەبێ ببووری کە بۆمان نەکرا بلاوی بکەینەوەو ، سوپاست دەکەین .

● **بۆ ئەو دۆستە ئازیزەی شیعری «هێز»ی بۆ ناردووین .**

برا گیان سوپاسی هاوکاریو دلسۆزیت دەکەین ، بەلام دەبێ بمانبەخشی کە هەر تەنها ئەم کۆپلەیەی شیعرەکەت شیاوی بلاوکردنەوە بوو کە لە خوارەوەدا بلاوی دەکەینەوە :

● **هێز** ●

چلە داری ، لە کەناری

ئاو دەبیزوان ، جارنا جاری

ئاوی وەستام

تا ببینم بەچاو ئاکام . .

* * *

● «**حلم لیلة علی شاطئ الخابور**» ، **شیعرێکی برادەرێکە لە شاری دهۆکەوە بۆی ناردووین** .

سوپاسی ئەو برادەرەمان دەکەین ، بەلام بەداخەوە شیعرەکەی لەگەل رێبازی گۆڤارەکەماندا ناگونجی ، بۆیە دەبێ ببووری کە بۆمان بلاونەکرایەوە . .

● **بۆ بەڕێز «عزت فندي»** ،

براگیان ، بابەتێکت بۆ ناردبووین دەربارەی مردنی یەکی لە نووسەرە ناودارەکانی کوردستانی ئەودیو ، بەلام داخمان ناچی کە نووسینەکە لەگەل رێبازی گۆڤارەکەماندا نەدەگونجاو ، شیاوی بلاوکردنەوە نەبوو لەبەر هەندی هۆی تایبەتی ، دەبێ بمانبەخشیو ، سوپاست دەکەین .

● «**نەخۆشی ی ئایدز**» **بابەتێکە برادەرێك لە کۆمەلگای «دیانا»وە بۆی ناردووین :**

برای ئازیز ، پێشەکی سوپاست دەکەین بۆ ئەو ئەرکەی کێشاوتە تاوەکو ئەم بابەتەت ئامادە کردووە ، بەلام خۆزگە هەولی ئەوەت دەدا باسەکەت شتێکی تازەو زۆر باس نەکراو دەبوو ، چونکە ئەم بابەتەی تۆ بۆت ناردووین هەموو هۆیەکانی راگەیاندن بە دووروو درێژی لی یەوە دواونو ، نووسینیان لەبارەیەوە بلاوکردۆتەوە ، بەجۆری کە ئەم باسەی تۆ ئەو تامو چێژەی نەماوە کە پێویستە ، هەرچی چۆنی بێ هیواداریین لە بلاونەکردنەوەیدا بمانبووریو ، لەمەودوا باسو بەرهەمی چاكو بەکەلکترمان بۆ بنێری کە شیاوی بلاوکردنەوە بێت .

● **بۆ ئەو برایانەی ئەم بەرهەمانەیان بۆ ناردووین :**

«جیهانی ئافرەت لەفەلسەفەی نیتشەدا ، رەنگو دەروونی مرۆڤ ، نەخۆشی ی مەلاریا» . .

سوپاسی ئەو هەستە پر لە دلسۆزییەتان دەکەین بەرامبەر بە گۆڤارەکەمان ، چاوەروانی بەرهەمی بەپیزتری ئێوەی براو دۆستی ئازیزین .

● **بۆ کاکە «فەهێل زێباری» لە پارێزگای «نینوی»وە .**

کاکی شیرین ، لەگەل رێزماندا بۆ ئەو هاوکارییەی لەگەل «کاروان»دا دەیکەی ، بەلام دەبێ ببووری کە ئەو

شیعرێ بە ناونیشانی «ل من پیرۆزکەن بەژنا جانیٚ» . هەر تەنها ئەم کوپلەیەی خوارەوەی شیاوی بلاوکردنەوە بوو . چاوەڕوانی بەرهەمی سەرکەوتووترتانین :

ئەز دیٚ جانا خوٚ خەملینم لوٚ گەلوٚ لوٚ
ئاڤا گولا لیٚ ڕەشینم لوٚ گەلوٚ لوٚ
دیٚ کەمە بیك بوٚ خوٚ ئینم لوٚ گەلوٚ لوٚ
دا تێر بەژنا ویٚ ببینم لوٚ گەلوٚ لوٚ

* * *

● **هەر دیسان برادەرێکی دیکە شیعرێکی بەم ناونیشانەوە بۆ ناردووین ، «هەڵهاتن و ئاوابوون» .**

کە ئەویش سەرجەمی شیعرەکەی شیاوی بلاوکردنەوە نەبوو ، بۆیە ئەم کۆپلەیەمان لیٚ هەڵبژاردوو ، وا لە خوارەوەدا بلاوی دەکەینەوە :

● **هەڵهاتن و ئاوابوون** ●

لە شەوێکا بە عەزرەتی بینینی تۆم
کێڵگەی خەیاڵ دەکێڵم و ،
جوگەلەی یاد ڕادەکێشمە ژوورەکەی خوٚم .
لە شەویکا کە بە تەنیام
پێکی ئەشقت دەنوٚشم و ،
شەوچەرەی ئازارم دەخوٚم .

* * *

● **بۆ کاکە «جمیل حسین» لە پارێزگای سلێمانیەوە :**

سوپاست دەکەین ، ئەو شیعرەی بە ناونیشانی «جەژنی نەورۆزەوە» بۆت ناردبووین لەگەڵ ڕەوتی گۆڤارەکەماندا نەگونجاو ، بۆمان نەکرا بەو بۆنەیەوە بلاوی بکەینەوە ، چاوەڕوانی بەرهەمی دیکەتانین و هەربژیت .

● **بۆ کاك «سالار احمد فتاح» ، لە شاری کەرکووکەوە ،**

براگیان ئەو بابەتەی بەناوی «بەبۆنەی نزیك بوونەوەی دەرکەوتنی کلکداری هالی»یەوە ، بۆت ناردبووین ، زۆری لەبارەیەوە بلاوکرابووەوە ، ئەمە جگە لەوەی هەر لەگۆڤارەکەی خۆماندا دوو بابەتی تێرو تەسەلی لەسەر بلاوکرایەوە . بۆیە دەبیٚ بمانبەخشی کە بابەتەکەت بواری بلاوکردنەوەی بۆ نەرەخسا . .

● **برادەرێك لە هەولێرەوە ڕەخنەیەکی بەم ناوەوە بۆ ناردووین : «کتێبی بیٚسەرپەرشتان و چەند کەم و کوڕیەك» .**

کاکی برا ، ئەم هەوڵەی تۆ مایەی ڕێزو دڵسۆزی ئێمەیە ، بەلاٚم دەبیٚ ببووری کە بۆمان نەکرا ڕەخنەکەت بلاو بکەینەوە . چونکە بە شێوەیەکی سەرپێیی نووسراوەتەوە ، هیواخوازین بەرهەمی چاکترمان بۆ بنێری .

● **کاك «غەمبار حمد مولود»**

بابەتێکی ٚ لەژێر ناونیشانی «سامی عەودال»ەوە بۆ ناردووین ، تاوەکو لەگۆشەی «لەیادی نەمراندا» بلاوی بکەینەوە ، بەلاٚم بەداخەوە نووسینەکە لە ئاستی «سامی عەودال»ی شاعیردا نیەو ، ئەم شاعیرە ئازیزو خوشەویستەمان زۆر لەوە زیاتر دەهێنیٚ ، بەهەرحاڵ سوپاسی ئەم برایە دەکەین و ، هیواداریین لێمان دڵگیر نەبیٚ کە نووسینەکەمان بلاونەکردەوە .

● **«ئاوێنەی ژین»**

ناونیشانی ئەو پارچە شیعرەیە کە برادەرێك لەکەرکووکەوە بۆی ناردووین ، بەلاٚم ئەو برادەرە دەبیٚ بمانبووریٚ کە دەڵێین شیعرەکە هەمووی شیاوی بلاوکردنەوە نەبوو ، بۆیە تەنها ئەم دوو کوپلەیەمان لیٚ هەڵبژاردوو وا بلاویان دەکەینەوە :

● **ئاوێنەی ژین** ●

ئێمەش ڕێبوارێکی ماندووی
ئەو ڕیٚو بووین بە تەواوی
پێم بڵیٚ وەك جاران خونچەی
یاخود گوڵێکی ژاکاوی

* * *

یادگارەکانی جێم هێشتوون

له شارۆچکەی دڵدا ماون
یاخود دوای من لەبن مێچی
ژوورەکەی خۆتا خنکاون ! !

* * *

● **بۆ «خ.ك. رحیم» لە شاری سلێمانیەوە** :

کاکی برا گلەیی ئەوەمان لێ دەکەی کە تائێستا چیرۆکێك و هۆنراوەیەکت بۆ ناردووین ، بەڵام هیچیان بلاونەبوونەتەوە ، کەچی گلەیی لەخۆت ناکەیت کە نامەکەت نە ناوی تەواوی خۆتی بەسەرەوەیەو ، نە لە نووسینی بابەتە تازەکەت ، کە بەناوی «وێنەیەك لە وولاتی مردووەکاندا» بۆت ناردووین دێرت پەڕاندووەو لەیەك دیوی کاغەزدا نووسیوتە ، کە دوو مەرجی سەرەکین لە بلاوکردنەوەدا ، بۆیە دەبێ پێشەکی گلەیی‌یەکە لەخۆت بکەی ، ئەوسا دەزانی بابەتەکانت بۆ بلاونەبوونەتەوە . .

● **بۆ کاکە «ئازاد گەردی» لەئێسکانی تازەی هەولێرەوە** :

براگیان ئێمەیش پڕ بەدڵ پیرۆزبایت لێ دەکەین کە ڕۆژی «١٩٨٦/٢/٢٤» ساڵێکی تەواو بەسەر پەیمانە بێ‌گەردەکەتاندا ڕەت دەبێ و هەر وەفاداری جارانی ، بەڵام دەبێ بمانبەخشی کە کاروان لەم بابەتە شیعرانە بلاو ناکاتەوەو ئێمەیش مەمنوون . .

● **ئازیزەکەم» پارچە شیعرێکی کاك «نادر محمود معروف»ە ، لە «قەڵادزێ»وە بۆی ناردووین** :

سوپاس بۆ ئەم برا شیرینەمان و بۆ ئەو هەستە ناسکەی کە لە پێشـەکی نامەکەیدا دەری بڕیوە ، ئێمەش ئەو برایە دڵنیا دەکەین کە هەموو نووسەرێکی دڵسۆز بۆی هەیە هاوبەشی بکات لە بەرەوپێش بردنی ڕەوتی گۆڤارەکەماندا ، بەڵام بەنووسین و بەرهەمی چاك و بەپێزو دەوڵەمەند کە شیاوی لاپەڕەکانی «کاروان» بن . . هەر بەم بۆنەیەشەوە کاکە «نادر» ئاگادار دەکەینەوە کە تەنها ئەم کۆپلەیەی شیعرەکەی شیاوی بلاوکردنەوە بوو ، وا لە خوارەوەدا بلاوی دەکەینەوە . .

● **ئازیزەکەم** ●

ئازیزەکەم ، تۆ دەتەوێ
بەنازەوە بمدوێنی
بەچەند دێڕێك ووشەی ناسك
هیوای گەشم بڕوخێنی
گوڵی باخی ،
سێ بەهاری چاوەڕوانیم
بەهێواشی بوەرێنی

* * *

● **بۆ کاك «جەوهەر جلال» ، لە «قەڵادزێ»وە** :

سوپاست دەکەین بۆ ئەو شیعرەی کە بەناونیشانی «عەشقێکی شێت»ەوە ، بۆت ناردووین ، بەڵام داخمان ناچێ کە هەر تەنها ئەم کۆپلەیەی خوارەوەی شیاوی بلاوکردنەوە بوو . .

● **عەشقێکی شێت** ●

ئەگەر ئێستا لەلام ئەبووی
ئەتبینی بوومەتە «مۆم»و ،
بەگڕی خۆم ئەتوێمەوە .
جارجاریش ، دەبمە پەپوولەو ،
لەدەوری «گڕ» دەخولێمەوە .

* * *

● **بۆ کاکە هونەر عبدالرحمن هنارەیی لە هەولێرەوە** :

سوپاست دەکەین لەبریتی ئەو شیعرەی کە بەناوی «دۆستی نەزان مەبە» بۆت ناردووین . . بەڵام دەبێ بمانبووری کە دەڵێین شیاوی بلاوکردنەوە نەبوو ، چاوەڕوانی بەرهەم و نووسینی سەرکەوتووترت لێ دەکەین و هەربژیت . .

● **«ساتەکانی خۆشەویستی» شیعرێکی کاك «حیدر محمدأمین»ە ، لەقەزای «دووبز»ەوە ، بۆی ناردووین** . .

سوپاسی ئەم برا ئازیزەمان دەکەین و هیواداریـن زیاتر لە هونەری شیعر شارەزابێت تا بتوانێ چاکتر لەو مەیدانەدا

ئەسپی خۆی تاوبداو بەرهەمی بەپێزتر پێشکەش خوێنەران بکات ، ئەمەیش کۆپلەیەکی شیعرەکەیەتی کە بۆی ناردووین . .

● **ساتەکانی خۆشەویستی** ●

شیرینەکەم ، ساڵەهایە بۆت دەگەڕێم
تامەزرۆمە ووشەیەکی جوانو ناسك
بیبیستی گوێم . .
دەسا چیتر ،
دەرگای حەزت ، دامەخە لێم .
بەڵکو جارجار ،
بۆ زاخاوی مێشکی سڕبووم
بۆ ئارامی دڵەی ماندووم
بۆ جیَ ژووانی جارانت بێم . .

* *

● **بۆ برای هێژا کاك محمد فرحان بۆتانی لە زانکۆی «موصل» کۆلیجی کشتوکاڵ . .**

بەختەوەربووین بە بەشداری کردنی بەرێزتان لە گۆڤارەکەماندا ، ئەویش بەناردنی ئەو پارچە شیعرەی بەناونیشانی «پیربووم ، دڵ پیرنابی» کە بەبۆنەی کۆچکردنی «جگەر خوێن»ی شاعیرەوە بۆت ناردووین ، بەڵام بەداخەوە هەمووی شیاوی بڵاوکردنەوە نەبوو ، بۆیە ئەم کۆپلەیەمان لیَ ی هەڵبژاردو ، وا لەخوارەوە پێشکەشی خوێنەرانی گۆڤارەکەمانی دەکەینو، چاوەڕوانی بەرهەمی دیکەتانینو هەربژیت . .

● **پیربووم ، دڵ پیرنابی** ●

بسکان ڤەکە
زولفان شەکە
دل پیر مەکە
جارەك ل پشت بەردی دەری
دیَمیَن د گەش
چاڤیَن د ڕەش
خالیَن مە بەش
برهیَن بوەش
هلدە کو هەر ڕۆژ بێتە دەری

* * *

● بۆ خوشکە «ل . س . م» ، سوپاست دەکەین بۆ ئەو چیرۆکە – بەسەرهاتە – ی ، بەناونیشانی «ئافرەتێکی بەندکراو لە هۆڵێکی گەورەدا» . . کە بۆت ناردبووین ، بەڵام دەبیَ بیووری کە هێشتا زۆری ماوە ببێتە چیرۆکێکی هونەری ، بەڵکو هەر تەنها بەسەرهاتێکی سادەیەو بەس ، ئاواتە خوازین بەرهەمی سەرکەوتووترمان بۆ بنێری ، دووبارە سوپاس .

● **بۆ برای ئازیزمان کاکە عبدالستار شوانی لەشاری کەرکووکەوە :**

کاکی برا ، ئەو هەڵبەستەی بەناونیشانی «ئەوینی دوو دڵدار»ەوە بۆت ناردووین ، بەلای ئێمەوە تەنها ئەم کۆپلەیەی شیاوی بڵاوکردنەوە بوو کە لەخوارەوەدا بڵاومان کردوتەوە :

● **ئەوینی دوو دڵدار** ●

دەوەرە ئەی دڵدارەکەم
لەکاروانی ئەم جارەیان جێم مەهێڵە
غەمی کۆڵم داماڵینەو ،
لە تروێکی جوانیتدا
لە کۆشکی چاوەکانتدا
جیهانێکی نوێم بۆ بێنە !

* * *

● **خوێنەرانی ئازیزو خۆشەویست ،**

وا ئەمجارەیش گەشتەکەمان تەواو دەبیَ ، دوای ئەوەی وەڵامی بەشێکی تری نامەو نوسینو بەرهەمەکانی دۆستو هاوڕیَو دڵسۆزانی گۆڤارەکەمانمان دایەوە ، بەهیوای ئەوەین توانیبێتمان دڵگرانیان نەکەین بەو وەڵامانەی ژمارەی ئەمجارەی گۆڤارەکەمان ، ئیتر لێرەدا دەوەستینو ، هیوای سەرفرازی بۆ هەموو لایەك دەخوازینو ، هەربژین .

# كاروان




مجلة ثقافية شهرية
تصدرها الامانة العامة للثقافة و الشباب
باللغتين الكردية والعربية

رئيس التحرير
محمد امين محمد احمد

نائب رئيس التحرير
حسين عارف

52

كانون الثاني /١٩٨٧

السنة الخامسة



العنوان : اربيل ـ الامانة العامة للثقافة والشباب ـ مجلة كاروان ـ هاتف / ٢١٩٢٢

ألقيت في مهرجان يوم الشهيد ١/١٢/١٩٨٦ في السليمانية

الشيخ محمد قرەداغي

حيّي الشهيد وحيّي المجد والكرما
حيّي الدم القاني المهراقَ نعم دما
حيّي الفداء وحيّي التضحيات كذا
حيّي البطولات والأيثارَ والشمى
حيّي الأولى جاهدوا جادوا بأنفسهم
فأستشهدوا بعد أن أعلَوا لنا العَلَما
دماءوهمُ سطّرت في الكون مفخرة
تتلى مدى الدهر أجهاراً ومكتتما
هم صانعوا النصر تلو النصر دون وجل
بقدس أنفاسهم أنف العدى رغما
هم أثروا الموت في إحياء أمتهم
حتى تُرى دائماً قد برّت الأمما
هم الكرام الأولى أختاروا الشهادة كي
يبقى العراقُ حصيناً لا يُطال حمى
حيّوا الشهادة دوماً فهي منزلة
يحظى بها من حوى الأيمان والهمما
أن الشهادة أولى الحسنيين، لذا
من نالها نال عزّاً خالداً وسما
فالاكرمون لدى ربّي همُ الشهداء
سَخَرْ لمدحهمُ الأقوال والقلما

* * *

إني لأقسم لا زوراً ولا أشرا
بالله ناصرنا أعظِمْ به قسما
إن العراق قويٌ جيشه بطلٌ
أذاق جيش البغاة الذل فانهزما
أن الصقور الجو قد سكبوا
على رؤوس الأعادي الموت والحُمما
أن الأسودَ أسود البِّر أذ وثبوا
من أيدهم خصْمُهُم كأسَ الردى أستلما
ولا تسل عن رجال البحر أنهمُ
من أستفزّهمُ في البحر مات ظما
وفتيةٍ نذروا للذود عن وطني
حياتهم فأبادوا الفرس والعجما
فاقت شجاعتهم وصفي وموهبتي
أنجازهمُ أعجز التبيان والكلما
أذا رأهم عدوٌ في منازلة
أصيب من غيظة بصدمة وعمى
فما رموا إذ رمَوا يوم اللقاء الهمجا
لكنهم عنهمُ ربُّ العباد رمى
أن العراق منيعٌ شعبه أتحدا
الكرد والعرب خلف القائد أنتظما
وكل فرد بنا جنديٌ معركةٍ
وللشهادة مشروعٌ، قد أعتزما
أما أنتصارٌ وفوزٌ لا هوان به
أو أن نموت شهيداً نربح النِعَما
لا نقبل الضيم في سرّ ولا علن
في أرضنا نقبر العدوان إن هجما
خاب العدوُّ فما يحظى بمأربه
جنى المذلة والخسران والندما

* * *

فيا شهيداً ثوى في خير منزلة

بيوم ذكراه نشدو الشعر والنغما
لك الخلود وتحيى عيشة رغدا
في جنة الخلد لا موتاً ولا ألما
أضاء من نوركم بين الورى قبس
أنار فينا سهول الارض والقمما
وزادنا في الوغى عزماً ومقدرة
نردي بصولتنا الذي بنا اصطدما
باء الخميني بالخسران مندحراً
يجني الشقا ما إذا بالسلم ما التزما
فنحن سلم لمن للسلم قد جنحا
ونحن حرب على من جار أو ظلما
ان الخميني سفاح و ذو دجلٍ
وليس في رهطه من كان محترما
أقصى بطولاتهم قصف المساكن أو
قتل الاسارى وذا في ديننا حَرُما
بذاك أفتاهم الدجال في صلف
وزاد رجساً بذا طهر انهم وقُما
فهو الذي يدعى الاسلام منتحلا
وجرمه عند شرع الله قد عظُما
اذ خالف الدين والاسلام دون حيا
وحالف اليانكي والصهيون والصَّنما
بصفقة العار في تزويره افتضحا
فلج في الغي ما استحيا ولا احتشما
بعد الفضيحة ماقول (الامام) وما
يقول فيما جنى من بعد ما جَرَما
اعطاه سيده ريغان اسلحةً
لحربنا مثلما شيطانه رسما
وظن جهلاً ووهما بالنجاة اذا
من اليهود وامريكانه دُعما
لكنه ضل فيما ظنه عبثا
فواقع الحرب في نصرٍ لنا حُسما
ليعلم الجانى أن الحقَ منتصر

إنا على الحق ، حبلُ الباطل إنصرما
فليخجل القرد من يوم ادعى أنه
يحرر القدس والاقصى كما زعما
تبت يداك لقد والبيت مغتصباً
(شلت يمينك إن قتلت لمسم)

* * *

نحن الحماة نصون الدين والوطنا
نبني حضارتنا ان غيرنا هدما
ونحن شعب على الاقدام قد طبعا
ما ملَّ يوماً نضالا لا ولا سئما
دم الشهيد ببشرى نصرنا نطقا
بذلك الله في قرانه حكما
اولىً وثانيةً ، فالفرس ما اتعظوا
في القادسية غيث الانتصارهم

* * *

خوێنی شەهیدە ئەڵێ عێراق ئەبێ سەرکەوێ
خوێنی شەهیدە ئەڵێ خومەینی چوو بەخوم
گەلی عیراق نەبەنە زکوردی لەگەڵ عەرەبی
بەرێی شەهیدایە دوشمن بۆیە باوی نەم
بەنووری خوێنی شەهیدە روونا کو پاکە وولات
دوشمن رێی لێ تێکچووە لەناو تاریکی تەم
سەربەرزە ئالاکەمان ، پیرۆزە خاکەکەمان
دڵسوزە هۆزەکەمان لە رەنجی زۆرو کەم

* * *

يا رب فانشر سلاما في مرابعنا
عجل لنا نصرنا يا ارحم الرح
يارب فارحم شهيدا ، فُك من أسرا
والهم الصبر والسلوان اهل
واحفظ عراقا وأزر جيشه البطلا
صن شعبه دائماً في رفعه ون
والقائد الفذ صدام يهيب بنا
نمشي على خطوة نحو العُلى قُدُما

# لالش (*)

من الأماكن الأثرية القديمة في منطقة الشيخان معبد مقدس لدى أهل المنطقة يسمى بـ «لالش» . يقع في مضيق بين جبال ثلاثة عليها أشجار باسقة . جبل (عەرەفات) من الشمال وجبل (مشەت) من الجنوب وجبل (حزرەت) من الغرب . يبعد عن عين سفني مركز قضاء الشيخان حوالي (١٠) كيلو مترات على يسار الطريق المؤدي الى ناحية المزوري (أتروش) .

عند الولوج الى هذا الوادي المقدس نجد في بدايته قنطرة صغيرة على ساقية ماء تسمى (پراصه راطى) أي جسر الصراط وفي داخل الوادي المقدس من جهة الجنوب بناية عليها قبة صغيرة وتقيم على بركة ماء تنبع من تحت جبل (مشەت) تسمى (كانيا سپي) محل تعميد اليزيدية ويجري الماء من هذه البركة الى حوضين يستخدم ماؤهما للشرب وأمام الـ (كانيا سپي) ساحة صغيرة وهي جلسة (أيزدين أمير) وخلفها يوجد مقام بارز عليه قبة مخروطية مضلعة وهو مقام الشيخ شمس ، وفي أسفل جبل عرفات هناك المعبد الرئيسي القائم على بركة ماء تسمى (زمزم)[1] وأمام المعبد ساحة كبيرة فيها غرف صغيرة تستخدم كدكاكين في أيام الأعياد ، ومن هذه الساحة (السوق) تدخل الى داخل المعبد عن طريق باب كبير يسمى (دەرێ مير) ثم ساحة صغيرة تسمى (جفاتاشيخ فەخر) ثم ساحة أخرى تسمى (جفاتا شيخ ئادى) فيها بركة ماء تسمى (حەودا كەلوكى) ومن هذه الساحة تدخل الى الباب الرئيسي للمعبد تسمى (قاپى) فعند الدخول من هذا الباب نجد وعلى اليمين بركة ماء تسمى (بيرا ناسردين) وفي الجهة اليسرى من المدخل قبر يعود الى الشيخ أدي الثاني بن الشيخ أبو البركات وفي غرفة صغيرة داخل المعبد قبر الشيخ أدي بن مسافر والذي يقع خلف (ديوانا بەرى شبايكى) من جهة الشمال . وأمام هذه الغرفة قبر أخر يعود الى الشيخ أبو البركات وفوق كل قبر من هذه القبور الثلاثة قبة مخروطية مضلعة . وفي داخل المعبد من جهة الشرق توجد غرفة واسعة تسمى (جلەخانە) وهي مخصصة لرجال الدين الذين يصومون الأربعينية ، وتوجد فسحة داخلية للمعبد تسمى (هندرو) . وينتهي المعبد من جهة الشرق بباب يؤدي الى قاعة كبيرة تسمى (رواقا شەر فەدين) والتي تؤدي الى فناء واسع يسمى (بانى فه قيرا) حيث محل سكنى سادن مقام الشيخ أدي . وهناك باب صغير (في الغرفة التي فيها قبر الشيخ أبو البركات) يؤدي الى (زمزم) ومنه الى ممر ضيق يؤدي الى محل يسمى (گاي كوژ) من جهة الجنوب وفي داخل المعبد وعند أجتياز الباب الخارجي (دە رێ مير) ونحو اليمين ممر يؤدي الى (بانى فه قيرا) .

وتنتشر في هذا الوادي المقدس وعلى سفوح الجبال المحيطة به مباني كثيرة وهي مقامات أولياء اليزيدية ومراقدهم ويتخذ الناس من هذه المباني محلات لأستقرارهم في الأعياد والمناسبات الدينية في «لالش» .

أن «لالش» محل حج اليزيدية ومن أقدس الأماكن لديهم حيث يحرم فيه القتل والنهب والفسق والفساد ولا يجوز فيه الصيد وقطع الأشجار . وتعتقد اليزيدية بأن الله جل جلاله عندما كان سائراً بمركبته هو وملائكته في البحار (في بدء التكوين) ، أستقر في لالش وقال (هذه هي الدار حقاً) وأمر بأن تكون (كانياسپي) قبلة للأولياء الصالحين . أنظر النص الأتي من (قەولى زەبوونى مەكسوور) .

بەدشێ من لـمەركەبێ دبووسوارە
بەدشايە وهەرهەفت يارە
تيك دسەيرين لـچار كنارە
لـلا لشي سەكنى گۆت : «ئەفەحەق وارە»

* * *





یەری نەعەرد هەبوو نەعە سمانە
نەبەحر هەبوو نە بنیانە
نە چیاهە بوو نە سکانە

* * *

ری هەبوو مەعریفەتە
ئیان هەبوو تەریقەتە
ئەویٚ رۆژیٚ کانیاسپی بومیرا کربوو قیبلەتە

* * *

**الترجمة :**

سار إلهي بالمركبة
هو وملائكته السبعة
وطافوا الجهات الأربع
ووقف في لالش وقال : «هذه هي الدار حقاً»

* * *

كان الأيمان بهذه الصفة :
قبل خلق الأرض والسماء
قبل البحار والبراري
وقبل الجبال وتثبيتها

* * * *

كانت هناك «المعرفة»
وهي طريق الأيمان
في ذلك اليوم جعل الله (كانياسپي) قبلة الأولياء

* * *

وتجرى في (لالش) أعياد ومراسيم خاصة وهي عيد أربعينية الصيف والشتاء (جەژنا چلەی) وعيد التجمع (جەژناجە مابی) وعيد الحج (القربان) (جەژناحە جيا) وعيد ليلة البركات (جەژ ناشەڤ بەراتی) . ومن المراسيم التي تجرى في هذه الأعياد هي : «قەتئارە» و (سەما) و (بەری شبابکی) و(قەباغ) . . الخ .

لقد جاء ذكر (لالش) في أبحاث ومقالات الكثير من الباحثين والكتاب ووصفوا الأعياد والمراسيم التي تقام فيه إلا أنه تضاربت الأراء حول أصله . . ولكن يتفق معظم الباحثين بأن منطقة لالش وهكار كانت مسكونة من قبل أقوام عديدة التجأت اليها في مراحل تأريخية مختلفة حيث قصدها الفارون وطالبوا الأمان والسلامة منذ أزمان طويلة ، فسكنها جماعات أشورية بعد سقوط نينوى عام ٦١٢ ق . م وظلت تمارس عباداتها الى أن لحقت بها جماعات مثرائية بعد سقوط مدينة الحضر (Hatra) في أواسط القرن الثالث الميلادي . وهاجرت اليها جماعات زردەشتية من منطقة (أيزد) في بلاد فارس أثناء الفتوحات الأسلامية في عهد الخليفة عمر بن الخطاب فأمتزجت هذه الجماعات مع بعضها بمرور الزمن وأطلق عليها الجماعات الشمسية (الشمسانية)(٢) . لذا أصبح لالش مركزاً دينياً مقدساً لهذه الجماعات وأستمرت بممارسة عباداتها فيه .

أما عن هذا المعبد فهناك رواية تقول : «أنه كان ديراً أسسه الراهبان مار يوحنا ومار أيشوع صبران في القرن السابع الميلادي حيث يقول الراهب راميشوع في مخطوطته التي كتبها باللغة الأرامية في حدود سنة ٨٥٥ هـ — ١٤٥٢ م يقول :

(أن مرقد الشيخ عدي الحالي كان ديراً أسسه الراهبان مار يوحنا وأيشوع صبران في القرن السابع الميلادي وكان يسكن هذا الدير رهبان عديدون وكان الرهبان قد عهدوا الى أهل عدي بن مسافر الكردي رعاية أغنام الدير لأن عدياً كان صغير السن فلما ترعرع تزوج من فتاة شهيرة رفعت مقامه لدى رئيس الدير حتى ولاه شؤون الدير ورعاية أغنامه . . وكانت عادة رهبان الدير المذكور أن يذهبوا في كل سنة لحج المقدس (أورشليم) فتبقى أدارة شؤون الدير بيد عدي بدون مناوئ . . وفي سنة ٦١٦ هـ — ١٢١٩ م أختلف رئيس الدير مع عدي بن مسافر الكردي . . فما كان الرهبان ورئيسهم يقصدون المقدس — على جاري عادتهم — حتى أغار عدي ومن معه من الأشياع على الدير فقتلوا من فيه

وجعلوه مقرهم ، فلما عاد الرئيس حاول أن يسترجع ديره بالحسنى فأخفق فذهب تواً الى قائد المغول في فارس متضرعاً اليه أن يعيد اليه ديره فوعده خيراً وفي عام ٦١٩ هـ - ١٢٢٢ م كان المغول يقاتلون في أربل فقبض قائدهم على عدي بن مسافر الكردي وأرسله الى السلطان الأعظم في (مراغة) . فما كان من السلطان إلا أن أصدر بحقه حكم الموت فقتل . . . وفي أيام تكوادور خان عاد أصحاب عدي فأسترجعوا الدير وبقي في إيديهم الى اليوم)[3] .

أود أن أذكر بعض المغالطات التي وقع فيها صاحب المخطوطة : -

١ - قال الراهب راميشوع : (وفي سنة ٦١٦ هـ - ١٢١٩ م) أختلف رئيس الدير مع عدي بن مسافر الكردي) . ولكن جاء في كتب التأريخ أن الشيخ أدي (عدي) بن مسافر توفي ودفن في لالش حوالي سنة (٥٥٧ هـ - ١١٦١ م) .

٢ - وجاء في المخطوطة أيضاً : (أن الرهبان قد عهدوا الى أهل عدي بن مسافر الكردي رعاية أغنام الدير لأن عدياً كان صغير السن فلما ترعرع تزوج من فتاة شهيرة رفعت مقامه لدى رئيس الدير) . ولكن وكما هو معروف في التأريخ اليزيدي وفي كتب التأريخ بأن الشيخ أدي (عدي بن مسافر) عندما جاء من الشام وسكن لالش كان مسناً وتوفي أعزباً لم يتزوج .

لذا لا يمكن أن يكون الشيخ عدي المذكور في مخطوطة راميشوع هو الشيخ أدي (عدي) بن مسافر الذي نعرفه ، ولربما يكون الشيخ أدي الثاني بن الشيخ أبو البركات والملقب بالكردي ولكن هل يعقل أن الشيخ أدي (عدي) الثاني الذي هو من عائلة أجتماعية ودينية عريقة ومن أولياء الأيزيدية يصبح راعياً لأغنام الدير هو أو أهله ؟ ! . وعلى كل حال اذا كان الراهب راميشوع يقصد في مخطوطته الشيخ أدي بن مسافر فهذا وهم كما بينا ، وأذا كان المقصود هو الشيخ أدي الثاني فهذا لا يعني أن معبد لالش كان ديراً لأنه : سكن في هذا المعبد أولياء اليزيدية قبل الشيخ أدي الثاني بل قبل الشيخ أدي بن مسافر أيضاً حيث كان (أيزدين أمير) والد كل من الشيخ شمس والشيخ فخر وناسردين وسجادين أميراً في لالش قبل مجيئ الشيخ أدي بن مسافر اليه وكان من أهم المراكز الدينية وأقدسها لدى الأيزيدية قبل الميلاد .

أما السيد جورج حبيب فأنه يستبعد كون معبد لالش كان ديراً حيث يقول : - (غير أننا لو رجعنا الى المصادر المسيحية الموثوقة لوجدنا ما يناقض هذا الأدعاء (أي كون لالش كان ديراً) ، والواقع أن معظم الباحثين يرفض هذا القول)[4] . ويأتي بأدلة تأريخية وأثرية عديدة بأن هذا المعبد لم يكن ديراً وإنما كان معبداً مترائياً (شمسياً) .

وأخيراً نحن نعلم بأن هذا المعبد قد وقع بأيدي المسلمين والمسيحيين مرات عديدة نتيجة للأضطهادات الدينية وفي أزمنة مختلفة فلربما أخرج من أيدي اليزيدية بعد وفاة الشيخ أدي بن مسافر من قبل المسيحيين وأتخذوه ديراً لهم ثم أسترجعه الشيخ أدي الثاني الذي كان يسكن قرية (بوزان) كما معروف لدى أهل المنطقة . كما أستولى المسلمون على هذا المعبد مرات عديدة وأخرها سنة ١٨٨٢ م من قبل الفريق وهبي باشا وجعله مدرسة دينية أسلامية من ١٨٩٣م الى سنة ١٩٠٥م وعين الشيخ أمين أفندي القره‌داغي مدرساً فيه . لذا فلا نستغرب إذا وجدنا كتابات أو رموز أسلامية أو مسيحية في هذا المعبد حيث أن تأريخ هذه الكتابات والمظاهر غير الأيزيدية الموجودة في لالش يعود الى أيام الأضطهادات عند أخراج لالش من أيدي اليزيدية .

**الهوامش :**

* لالش : جاءت كلمة لالش من مقطعين (لال) بمعنى الأخرس و (هش) بمعنى الوعي أو الشعور . لذا فأن لالش = الأخرس الواعي . وقد سمعنا من بعض الرجال المسنين في المنطقة : بأن الأنسان في لالش يجب عليه أن يكون واعياً كثير التفكير بقدرات ربه وقليل الكلام عن الدنيا وملذاتها بل عدم التفكير بها .

١ - تسمى بعض الأماكن في لالش بأسماء أماكن موجودة في المكة المكرمة مثل زمزم وعرفات . . الخ ، وذلك تمجيداً لسيد الأنبياء أبراهيم الخليل وأبنه أسماعيل عليهما السلام .

٢ - اليزيدية أحوالهم ومعتقداتهم - د . سامي سعيد الأحمد ص ٣٦ . ٣٩

٣ - اليزيديون في حاضرهم وماضيهم - السيد عبدالرزاق الحسني ص ٢٩

٤ - اليزيدية بقايا دين قديم - السيد جورج حبيب ص ٤٨ .

